


چاپی دووەم



# قەڵاتی ئەستێرەی

رۆمان

کەریم کاکە





ناوەندی ڕۆشنبیریی

مەم و زین

---

● ناوی کتێب: ئەستێرەی قەڵاتێ
● نووسەر: کەریم کاکە
● نەخشەسازی ناوەوە: ناوەندی مەم و زین
● نەخشەسازی بەرگ: پەپوولە یوسفی
● تابلۆی بەرگ: محەمەد ئیسماعیل
● بابەت: ڕۆمان
● نۆبەتی چاپ: دووەم - ۲۰۲۲
● تیراژ: ٥۰۰ دانە
● نرخ: ٤۰۰۰ دینار

---

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (۷٥۸)ی ساڵی (۲۰۱۷)ی پێدراوە.





memuzin20@gmail.com

# ١

*لاوک، لاوک، لاوکەکە کوا؟*

لە سەر ئەوە بوو، ئاوی بۆ گەرم بکەن، کەچی لە ناو خوێنەوە لە لاوکەکەی دەپێچایەوە. هەر لەبەر هەندێ، ناوی وی بە پیری لاوک کەوتە سەر زاری هەندێ.

مالنووستنانە، لەو سەرە کۆلانە فڕێیاندا کە بە نوێژی نیوەڕۆیێ هەڵیانگرت و هەڵیاندایە ناو تڕومبێلە جام تارەکە. پیری لاوک کە لە رووناکی بزربوو، لە تاریکی دەرکەوتەوە. وەک چۆن لە سەر زەوی جێی نیوە مرۆڤێکی گرتبوو، لە ناو زەویش - ئەگەر گۆڕی پێ رەوا ببینن- لە دوو سێ بستێ جێیدەبێتەوە. تەمەن و دارکاری هێندەیان پێوەنەهێشتۆتەوە. پێویست بە دارەبازەش ناکات. رێی گۆڕستان نزیکە و وەک مەلۆتکە لە سەر دەستان هەڵدەگیرێ.

ساڵانێک بە سەر ئەو شەوە خوێناوی و فرمێسکاویەی پیری لاوک تێدەپەڕێ. ئاخر ئەو شەوەی لە سەر جادە هەڵمگرتەوە، بە دوای ماماندا دەچووم. تکای دنیام لە ژنەکەم کرد بچینە خەستەخانە، تکای وەرنەگرتم و مامانی ویست. پیری لاوک مامانی لەبیربردمەوە. ژنەکەم بە سەر منداڵەوە چوو. منداڵەکەش لەگەڵ دایکی چوو.

ئەو شەوەی (ئەمن) کاریان بە پیری لاوک نەما و هێنایانەوە جێی خۆی، شەوێکە لەبیرناچێتەوە. ئەو شەوە مەرگی ژنەکەم پیری لاوکی لەبیربردمەوە، مرد، نەمرد! لە کوێیان ناشت! لە گۆڕستانی گەورەی شار، گۆڕێکی تازە کەوتبووە تەنیشت گۆڕی ژنەکەم. نزیک گۆڕی شاعیری خەندەی بایی. وای بۆ دەچم گۆڕی ئەو بووبێت. هەرچەندە قسە هەیە، ئەو شەوە بەر لە گیاندانێ:

ئەستێرەیەکی تژی لە ورشە داکشایە حەوشە. رووناک، کەس چاوی لە بەری هەڵنەدەهات، تا ببینێ چ روودەدات. بەڵام دوای هەڵکشان و چوونەوەی بۆ ئاسمانێ، پیری لاوک لە سەر جێ نەمابوو.

چیرۆک وا دەخوازێ لێرەوە لە جێی لاوک، پەنهانزان گۆبکەین و ناوی ببێتە پیری پەنهانزان. خۆ منیش لەو شەوەوە ناوی خۆم گۆڕی بۆ (سێزدە) بەو ناوە نەبێ وەلامی کەسم نەداوەتەوە. ئاخر ئەو شەوە لە هەموو شەو و رۆژان سێزدەتر بوو، ئەز لە سێزدەی گەلارێزان هاتوومەتە دنیا، لە تەمەنی سێزدە رۆژی بابم فڕۆکە کوشتی، سێزدە سالان بووم دایکیشم هەر بر فڕۆکە چوو، سێزدە مانگیش لە باوەشی ئەستێرە نووستم، مردنەکەشی کەوتە سێزدەی مانگ.

لە سەر بانەوە گرتنەکەشیم دیت. چەند خولەکێ بەر لە دەنگی تەقەکە، پیری پەنهانزان بە کووڕە کووڕ و بە هەڵەداوان بەرە و ئەو سەرە کۆلانە دەڕۆیشت کە ڕێی پیاوەکە بوو. ئەو پیاوەی کەس نیە نەیناسێ و کۆتایی چیرۆکەکەشە. ئەو پیاوەی لە بن دیواری قوتابخانەکە بە دەسترێژێک ساردیان کردەوە، مندال دەوریان دا و گەیاندیانە خەستەخانە، بەلام کار لە کار ترازابوو.

بە چاوی خۆم دیتم، پیری پەنهانزان خۆش خۆش دەڕۆیشت. وەک بلێی دلی تریواندبێ. لێ نەگەیشت، ئەوان گەیشتن و بردیان. هەینێ ژنەکەم زگی شەش

مانگان بوو، دڵەکزەی دەگرت. لەگەڵ ماڵی پیری پەنهانزان ماڵێکمان بەین بوو، لە شەوێکی خراپ هێنایانەوە.

لەو چەند ساڵە دنیا بە شێوەیەک گۆڕاوە، ناناسرێتەوە. ئەو گۆڕانە باش کەوتەوە، وا نەبا کەس سەربردەی پیری پەنهانزانی نەدەزانی. رازی ئەوی نەدەزانی. نهێنیەک لە زۆر جێ با بە رەوتی مێژوو دەداتەوە و دەیداتە ڕێچکەیەکیدی. سەربردەی ئەو پیاوە لە لاوک و داستانیش جێی نابێتەوە. مێژوو دەترسێ لە خۆی بگرێ. سەربردەیەکی درێژ و رازدار، لە دەوروبەری قەڵای دمدمەوە دێ و زۆر جێ دەکات و دەگاتەوە بن قەڵاتی ئێرە.

لە زاری پیری پەنهانزانەوە کەس شتێکی ئەوتۆی نەبیست، خەڵک بۆنی شتێکی وای لێبکات. ئەو پیاوە ئەو هەموو ساڵە چۆن ئەو دنیا رازەی لە دڵ پاراست و بە زاریدا نەهات! ئێران و توووران و بەغدای کردبوو، سەراو و دەراوی زۆر دیتبوو، دنیا گەڕابوو. تا تەواو دانەکەوت، بە یەکجاری نەهاتەوە زێد. کەمدوو بوو، بەتۆبزیش قسەی نەدەکرد. بە ئا و نا و زۆر بە کورتی وەڵامی قسە و پرسیارانی

دەدایەوە. دواتر بیستمەوە لە بارەی رازەکەیەوە لە شێوەی ورێنە، شتێکی کەمی لای نەوەکەی بە گۆڕێ وەرکردبوو، کەس بە هەندی هەڵنەگرتبوو. بەڵام دوای رووداوەکە قامچی هێنایە قسە، دیارە قامچی زمان دەخاتە زاری بەردیشەوە.

گۆڕانی دنیا، قامچیشی هێنایە قسە، قامچی پێیلێنا. وەک چۆن پیری پەنهانزان بەرگەی قامچی نەگرت و بن بەڕەی بۆ هێنایە سەر بەڕە، نیو سەدەیەکی بۆ گێڕایەوە، قامچیش هاتە قسە و بە درووداو پیری پەنهانزانی گێڕایەوە. پیاوێک ئەوەی پێش گۆڕانی دنیا ماڵی کەوتبووە نێوان ماڵێ مە و ماڵی پیری پەنهانزان و کەس هێندەی سەرە دەرزیەک گومانی خراپی لێنەدەکرد. ئێستا بە ترس و لەرزەوە، بە هەوکی پڕ گریانەوە دەگێڕێتەوە. ئەو پیاوەی ژنەکەمی لە گۆڕ دەرهێنا و خۆشی نازانێ چەندێ لە شار دووریخستەوە و لە کوێ خستیە بن خۆڵەوە، ئەو پیاوە وا دەگێڕێتەوە. لە قسان بە هەڵە بردوویانە، مەبەستیان ئەو نەبووە. دەزانم ئەو کەسانە جێی باوەڕ نین، بەڵام من باوەڕی پێدەکەم. رازی پیری پەنهانزان وای کرد باوەڕی پێبکەم. چەند رۆژێکیشە لەو دەشت و دەرە دەیگێڕم، ئێ، ئەوە خوایە بە جێیەکە بکەوێتەوە. ژنە گۆڕگومەکەم

ببینمەوە. لە بەدبەختی من ناچێتەوە سەری. ئەو پیاوە دوای ئەو هەموو ساڵە رستەیەکی پیری پەنهانزانی لەبیرنەچۆتەوە، کەچی بە جێی گۆڕێک ناکەوێتەوە.

## ٢

له بابم پتر خۆشمدەویست، بەڵام دەبوو زمانی لێبدەم. وام نەکردبا، نەخشەکە دەبووە ترِی ناو رانکێ و نێچیرەکە لە دەستدەچوو. کەمێک پێش گەڕانەوە و دەستبەکاربوون، لە حەوشەوە گوێم لێیە، پیاوە پیرەکە لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

دەیکوژن ئێستا دەیکوژن، دەبێت بیگەمێ و رێ بگۆڕێ.

لە دڵی خۆم گوتم، تۆ بڵێی مەبەستی ئەو بێت، ئای! کوڕە ناوەکەشی گوت، باشە لە کوێی زانیوە؟ تۆ بڵێی لە ناو ئێمە دەستێک هەبێ! گومانم لە خۆم کرد، گوتم رەنگە لە زارم دەرچووبێت. هاتمە دەرێ و دیتم لە سەرە کۆڵانێ سووڕایەوە. تەلەفۆنم بۆ ئەبوو عەلا کرد، کێشەکەم تێگەیاند. وەکات دەستەیەکی نارد، بردمان و پلانەکەمان سەریگرت.

ئەو پیرە پەنهانزانە بەرگەی سەرە سمێک ناگرێ، قامچی چی! هێندەی پشیلەیەکی لێ ماوەتەوە. لە

تووره‌گه‌یه‌ک جێی ده‌بێته‌وه. ناکرێ له ڕێی دارکاری و قـامچیه‌وه قسـه‌ی لـێ ده‌ربهێنـی. ئـاخر له‌گه‌ڵ قـامچیی یه‌که‌م فریـای زار هه‌ڵهێنـانه‌وه نـاکه‌وێ و گیانی ده‌گاته ئاسمانێ. له ده‌ستمانده‌چێ، شارێک، تۆ بڵێ وڵاتێک زانیاریی گرنگ له‌گه‌ڵ خۆی ده‌بات و ده‌سه‌ڵاتمان ده‌که‌وێته مه‌ترسی. له خۆمان ده‌پرسی:

جگه له قامچی، چی؟!

نه‌بـوو، قـامچی تـاکه چـاره‌یه. دنیایـان خسـته به‌رده‌می، ده‌ستی بۆ نه‌برد و ورته‌یه‌کی نه‌کرد. به زۆر شـه‌رابیان به قـوڕگیه‌وه ده‌کرد، ده‌خه‌وت و له خه‌وێـش زاری نه‌ده‌جـوولا. هه‌ڕه‌شـه‌ی نـاردنه دۆزه‌خیـان لێکـرد، خـۆی تێکـنه‌دا. ئه‌گه‌ر رسـته‌ی ((حه‌یـف، کوشـتیان))ی به زاردا نه‌هاتـایه، هه‌مـوو باوه‌ڕیـان ده‌هـات که ئه‌و پیـره که‌ڕولاڵه و له بنـی وشـه‌یه‌کی گـۆنه‌کردووه. منـیش ده‌که‌وتـمه گومـان، گومـان له‌وه‌ی ئه‌و پیـره‌ی رۆژانه چـاکۆچۆنیه‌کی گه‌رممـان ده‌کـرد و مـن به کـوردی به‌یـانی باشـم لێده‌کرد، ئه‌و به کـوردی و عه‌ره‌بی وه‌ڵامیده‌دایه‌وه، هه‌مـان ئه‌و پیـره بـێ، ئه‌وه‌تـا له بـن قـامچی له پشیله‌یه‌کی گیان تێدا نه‌ماو ده‌چێ.

+ ئەبوو نەجم، پیرە پشیلەکە بە تۆش نایەتە میاوە؟!

- من...

من نەمدەویست، پیرە پشیلەکە دارکاری بکەم، بەڵام فەرمانە و لە سەر سەرانە. بیرم نیە لەگەڵ قامچیی یەکەم چی روویدا، بەڵام لە بەرزکردنەوەی دووەم، بەو چاوانەی خۆم دیتم، ئەستێرەیەک لە پەنجەرەوە هاتە ژووری. لە سەر سینەی پیرە گیرسایەوە و لە رووناکایی بزریکرد. پیرە خۆی بوو ئەستێرە. یەکهی هەڵاتنی لە هەڵاتنی بیرمکەوتەوە، رەنگە سۆزی دراوسێتی ئەستێرەکەی هێنابێ، دەنا ئەستێرە خۆ کەلاشووشە نیە لە ئاسمانێ بکەوێتە خوارێ.

گەڕامەوە سەر پیرەی دراوسێ، نە رووناکایی هەیە، نە ئەستێرە لەوێ ماوە. پیری پەنهانزان لە گوشێکی لوولدراو دەچێ، لە سەر تەنیشتە، هەستمکرد پەڕۆکەکەی چاوی شلبۆتەوە، توندمکردەوە. دەستی کە لە پشتەوە بەسترابوونەوە. دەبینم سەری پەنجەکانی بە شێوەیەک لێکدەدان، وەک بڵێی شتێک بژمێرێ. خێرا خێراش فووی دەکرد، دەتگوت پارووە نانێکی

گەرمی لە دەستە و ساردی دەکاتەوە. دەنگی خۆم گۆڕی و فەرمانم پێکرد:

هەرچی دەزانی، بیڵێ.

بە دەنگێک دەتگوت لەوەوە نا، لە دیوارەکەوە بێتە گوێم:

حەیف، کوشتیان.

چارەی ئەو پیرە قامچیە. بەرزمکردەوە، رامنەوەشاندبوو، دیتم ئەستێرەکە وەک گوللە هات. هەوبوو، ئەستێرە بوو. لە کولانکە گچکەکەوە دیتم لە ئاسمانەوە هات، لە ناو ئەستێرانەوە هات، پیرەی بە رووناکیی خۆی داپۆشی.

سەرۆک هاوارە، ئەوە چیە، ئەو ئەستێرەیە، ئەو کەرتکە ئەستێرەیە بۆ وا دەکات؟ ئەوجارە لە جاری دی پتر ترسام. چاوم گرت و دەرپەڕیم. دەمویست لە قامچی بە دەستان بپرسم، داخوا ئێوەش ئەستێرەی واتان دیوە؟ نەوێرام، پرسیاری وا هی شێتانە. تۆ بڵێی من شێت بووبم! نابێت ئەبوو عەلا بەوە بزانێت، بەزمی ئەستێرەکە بەو بگاتەوە، لە جێی پیرەم دەبەستێتەوە و دەمخاتە ریزی ناپاکانەوە.

کاتی سەردانم بۆ لای پەنهانزانی بە ئەستێرە داپۆشراو گۆڕی. لە شەوەوە کردمە رۆژ. بە نوێژی نیوەڕۆیێ ئەستێرە چ دەکات، بۆی چووم. هێشتا قامچیم نەجوولاندبوو، ئەستێرە خۆی بە ژۆرێدا کرد. ئەستێرەی رۆژێ لە هی شەوێ رووناکترە، ئاوی چاوی دەبرد. نەک پیرە، دەستی خۆم نەدەدیت. لەو دەمەی ئەبوو عەلا گازیکردم، بیرێکی چاکم بە مێشکدا هات:

- پشیلەکەت نەهێنایە قسە؟

+**گەورەم**، خەمت نەبێت، زۆری نەماوە.

پیری پەنهانزانم راکێشایە چاوەیەکی داخراو، کونبڕ، تاریک، نەک ئەستێرە، پێشکەش رێی هاتنە ژۆرێی نیە. تاریکە، چاو چاو نابینێ. لایتێکی گچکەم لە سەر پیرە راگرت، ناوی سەرۆکم لێهێنا.

-ئەستێرەکە رێی نەبووبێت، یان لە سەرۆک ترسا؟

+پەلەت نەبێ.

بیرمچوو بڵێم، پێدەچوو ترسی ئەستێرەکەی لە رووم خوێندبێتەوە. چوونکێ یەک دوو جارێ

تیچاوێکی دامێ، لەرزم هاتێ. من دەزانم لە بن ئەو جۆرە تیچاوە چ شتێ هەیە. ئەو پیاوە تیچاوی وای دابێتە هەر (رەفیق)ێ، دەبێت قورِ بۆ خۆی بگریتەوە. ئەگەر زۆر سووک لە بنی دەرچێ، دوورخستنەوەیەتی بۆ بنی دنیا. بۆیە برِیارمدا، نەک ئەستێرە، خۆر بە خۆرایەتی خۆی بێتە سەر پشتی پیری پشیلەیی، قامچی خۆم بوەشێنم و بیهێنمە قسە. ئیدی ناوی سەرۆکم لێهێنا.

-تەنها ناوی سەرۆک، ناوی خودات نەهێنا؟

+لە زیندانێ، سەرۆک خودایە، مردن و ژیان لە دەست ئەودایە.

ئێ، بە نوێژی نیوەرِۆیێ، لە هۆدەیەکی لە شەو تاریکتر، قامچیم بادا. لە بن تیرۆژی کزی لایتەکە، بە ئاستەم لێوی دەجوولێ:

حەیف، کوشتیان.

گەیشتە کونە لووتم، گوتم:

ئێستا، دەتنێرمە کن ئەو.

هاته سەرم بە پێلەقە بکەومە سەری و سیسرکە ئاسا پانیبکەمەوە. باش بوو بیرمکەوتەوە کە ئەو پیاوە نابێت بمرێت، دەبێت بێتە گۆ، قامچی...



بۆوەی سەربردەی پیری لاوکی پەنهانزان وەک خۆی بچێتە دیرۆکەوە، بە دەردی ئەو سەربردانە نەچێ کە هەرکەسە بە دڵی خۆی، تام و خوێی پێوەکردووە. لێی بڕیوە و تێیبڕیوە و بە سینگی دیرۆکیەوە کردووە. ئەو پیاوە نابێت ببێتە درۆیەکیتری دیرۆک، بۆیە ئەبوو نەجم بەس نیە بۆ گێڕانەوەی وی.

ئاخر ناکرێ دیرۆک لە زاری کەسێکەوە تۆماربکرێ کە سەردەمێک سەرۆکی بە خودا زانیبوو. پیرێکی دراوسێی خۆی بە گرتن دا و هەر خۆشی دارکاری کرد. هەر ئەو پیاوە گۆڕی ژنێکی هیچ لە هیچ نەبووی، بە سەر منداڵەوە چوو، لە گۆڕەکەی خۆی دەربهێنێ. ئەو پیاوەی دەر و دراوسێ سوێندیان بە سەری دەخوارد، کەچی میرغەزەب دەرچوو. بۆیە هیچ نەبێ، یەک دوو کەسێ دەبێت پەیدا بن و گێڕانەوەی ئەبوو نەجم پشتڕاستبکەنەوە.

سەربردەی پیری پەنهانزان، وا چاکە، رۆماننووسیش هێندە خۆی تێهەڵنەقورتێنێ، چوونکێ بە بیانووی هونەرکاری و جوانگێڕانەوە، لە دیرۆکی دووردەخاتەوە.

## ٣

له هـۆدەی ئەشـكەنجە دەیانهێنـامەوە. چـاوم پـڕ خـوێن بـوو. بەردەمـی خـۆمم نەدەدی. بە دەنـگ ناسیمەوە. ناسیمەوە ئەبوو نەجمە. له دەنگیڕا دیار بوو چەند شپرزەیە:

*ئەستێرە، ئەستێرە، ئەستێرە هاتە ژوورێ.*

**وا تێگەیشـتم، پیـاوێکی گەورە هـاتووە و نـاوی ئەستێرەیە.**

❊❊❊

منیش لەوێ بووم. جارێک لە ڕێی ئاودەستێ، ئەو ئەبـوو نەجـمە بە تەنیشـتمدا تێـپەڕی و قـامچیەکی خێواندمێ و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

پیرە پشیلە ئەستێرە دەیپارێزێ.

❊❊❊

منیش شتێکم لە سەربردەی ئەو پیرە لە زاری خۆیەوە بیست. دوو شەو بەر لەوەی بزربێت، لە ژوورێک پێکەوەبووین. وەها شلوکوتیان کردبوو، خۆی رانەدەگرت. سەریم خستە سەر کۆشم، بە دەم خەوەوە پچڕپچڕ دەیگۆت:

گۆتم... هەم... شتم گۆت، لە قەلاتەوە... لۆ... قەلات...

ئەو شەوە دنیایەک وڕێنەی کرد. وڕێنەی سەرنج راکێش. وڕێنەی ناسک. حەیف، من هەینێ قسەکانی ئەو پیاوە بە وڕێنەکردن تێگەیشتبووم. ئەو پیاوە ئەو شەوە لە خۆشخوانێکی ماندوو دەچوو، بە رژد و هەڵدێرا هەڵگەڕێ و سەربردە بگێڕێتەوە. زار شیرنی لە شێوەی ئەو پیاوەم نەدیتبوو. بە تەرزێ سەربردەی دەگێڕایەوە، من ئێستاش دەڵێم یەکێک بووە لەو چیرۆکنووسانەی لە گابەردەوە ئاوی گێڕانەوە هەڵدەقوڵێنن و بەریدەدەنەوە. چەند جارێکیش لێم پرسی:

تۆ کێیت؟ خۆت بناسێنە.

ئەو شەوە پێنەدەچوو ببیستێ، تەنێ زاری دەگەڕا:

هەرچیم هەبوو، شتێکیشم لە کوڕە ئاڵا وەرگرت، بە ماینەکی شینکی بڕ گەزێک درێژم دا. لەو ماینانە بوو، فڕۆکە نەدەگەیشتە تۆزی پێی. لەو ماینانە بوو، بە سەر زێدا بازیدەدا. قەدبڕ چیای دەبڕی. ماینێ من باڵی گرت و مینا فڕۆکەی ئینگلیزی فڕی.

ماین دەتگوت دەزانێ، چیم لەدڵدایە. لە من بلەزتر بوو. لە دەمی ئالیکدانێش پشووی نەدەدا. سەر بە جۆڕکەوە چوار ناڵەی لێدەدا. بۆ ئاو خواردنەوەش هێندەی نیشتنەوەی چۆلەکەیەکی زارەتەریکی پێنەدەچوو. هەستمدەکرد، ئەو دەڵێ:

**درەنگە، توند خۆت بگرە، دەفڕم.**

فڕی، نازانم چەندم پێچوو. عەسرانێ گەیشتمە کوێستانی کێلەشینێ. لەوێ لە بڵندایی دنیایێ، لە زارکی رەشماڵێک گەردنکێلێک کە دەتگوت زادەی زەنوێرە، بە جامێک دۆوە جڵەوی ماینی لێوەرگرتم و گوتی:

سوارە سووکەڵانە، دەڵێی لە شامەڕێوە دێی. ماینەکەت رووبارێ عارەقەی دەرداوە.

وابوو، ئاورم لە جێپێی ماین دایەوە، عارەقە جۆگەلەی بەستبوو. لەوێ بایەکی تەزی هەڵیکرد.

قەدپاڵەکان بەفریان پێوە بوو. پشووێکی کورتمان دا. ماین لە من پەلەتر، من لەو پەلەتر، بە نووردووە نانێک و پەنیری مێرێ و پرسیاری کورتترین ڕێی شنۆیێ، ڕەشماڵنشینانم جێهێشت. پێم لە ڕکێف نا و فڕیم. لە شۆڕبوونەوە، تاریکیەکم بە سەردا هات. تارترین شەو، لەو دنیاش شەوی وا تار نیە. دوو بست پێش خۆم نەدەدیت. ماین ڕێی دەدیت، بەڵام وا دیارە ڕێ ڕێی لێدەبێتەوە. ماینش خۆ کچی ئەو وڵاتە نیە، بە چ بزانێ کام لەو ڕێیانە دەمانباتەوە ئەوێ.

نەخشەی ڕێم لە ڕەشماڵنشینانی کێلەشینێ وەرگرت. دەزانم ڕێ چەند ڕێی لێدەبێتەوە و هەر ڕێیە دەچێتەوە کوێ و ڕێی من کامەیانە. بەڵام بەو شەوە ئەنگوستەچاوە وا بڕی ماینەکەم نابینم، ڕێ دەبینمەوە؟ لەوێ لە ماینە شینکە کە منی بە فڕین گەیاندە ئێرە، پەشیمانبوومەوە. دەبوو ماینێکی ئەو هەرێمەم کڕیبا. ئێستا لە سەر پشتی پشتم لێدەکردەوە و دڵنیادەبووم دەمگەیەنێتە کوڕە بوێرەکەی غەزالی چاو ئەستێرە.

حەیف، بیرم لەوە نەکردبۆوە، شەو ڕۆیشتنم دەکەوێتە ئاقارێ. نە لووتکەیێ، نە گردۆلکەیێ، نە

بنەدارێـــک، نە چەمێکـــی ناســـینەوەی ڕێ خـــۆ نیشـانـدەدەن. هەوکە هەر دەبـێ چـاوەڕێی ئاسـمان بـکەم. مـانگم بـۆ بنێـرێ، مـانگی ڕێنیشـاندەر. دەی ئاسـمان، مانگت بنێـرە، هێنـدە کـاتەم بە دەسـتەوە نەمـاوە. مـن دەبێـت بیگەمـێ و پێیبڵـێم بە خـۆت نەکەویت، هێندەت نەماوە.

دەڵێی ئاسمانیش دەستی لەگەڵ ئەوان تێکەڵە. تاڵە تریفەیەکـــی ڕێنیشـــاندان شـــۆڕناکاتەوە. ئاســـمان دەستی لەگەڵ ئەوان تێکەڵکردبێ، لەدەستماندەچێت. دڵم دەڵێ ئەوشـو نەگەمـێ، کـار لە کـار دەتـرازێ. **ئاسمان بڕ را دەکات، ئەدی هەر ئەو نەبـوو، منـی بەو ڕێیە خست؟ هەر ئەو نەبوو لە سەرخەوشکانێ، گوتی:**

بیگەیێ، ئەو بچێ، خەونێکی گەورە دەچێ.

لەو تـــاریکە شـــەوە کە تروســـکاییەک نە لە ئاسـمان، نە لەزەویەوە دیارە، لە سەر زینـێ نـوێژم دابەسـت. لە هەر ڕکـاتێ سـەری مـاینم بە لایەکـدا دەسـووڕاند. دەمگـوت، یەکیـان هەر دەگـات. هەر جارەی بە ناوی پەیامبەرێ لە خـودا دەپاڕامەوە کە مانگ هەڵداتە ئاسمان و تریفە شۆڕبکاتەوە. زەوی و ڕێی کوڕی غەزاڵی چاوئەستێرە ببینمەوە.

خـودا لە ئاسـمانەوە رووناكـايى نەنـارد، بەڵام لە زەويەوە، ئاگرێ دەركەوت، لە ئاگرى دزان دەچـوو. دەست لە سەر مشـتووى خەنجەر، رووەو ئاگرەكە چووم. ئاگر بووە چەند ئاگرێ. تێگەيشـتم ئاوەدانيە. بەرەو ئـاوەدانى هەيهـام لە مـاين كـرد. لە دوورەوە سەگ پێشوازيیان لێم كرد. دەنگێك دەنگى دام، زۆر لە دەنگى تۆ دەچوو.

-دەنگى من؟!

پيــرى پەنهــانزان دەنگــى منــى نەبيســت و لە گێڕانەوەى خۆى نەكەوت:

گـوتم: منم، لە بنـى دنيـاوە هـاتووم. رێـى شنۆييێم بزركردووە.

كابرا بە زمانێكى لە قەند شيرنتر:

تۆ پشووێك بدە. چايەك وەخۆ. هەر شنۆ نا، رێى تارانيش لە سەر من.

رەنگە گوتبێتم رێى تاران كاول بێ. چايە بە گوللە دەسـتناكەوێ، كەچـى لەو درەنگـانى شـەوە، مـن قـۆريەك چـايەم هەڵقوڕانـد. بەڵام چ پێنـاچێ تـامم لێكردبێ.

+ئەرێ، ئەو ناکەسانە دەبێت چایەکمان نەدەنێ؟ !

ویستم بڵێم دوای نیو سەدە لە قۆریە چایەکەی پێشە تۆ، لێرە مەگەر بە مووشەک پیاڵەچایەک دەستکەوێ. قسەکەم گێڕاوە ئاخر پیری پەنهانزان تەنێ قسە دەکات و قسەی کەس نابیستێ:

ئەرێ من لە کەنگێوە بەڕێوەم؟ چەند شەوم بە سەردا هات؟ لە چەند جێ پشووم دا؟ جگە لە دوریەکەی کێلەشین و سەرسمەکە و پڕووشەی **تالگەکەی** رێ چ جێیدیم لەبیرنیە، ئێستا خانەخوێ **لە بن تیشکی چراڕەشکە** دەڵێی ئەستێرەی سیوەیلە **دەدرەوشێتەوە**، **بەو** درەنگانی شەوە بارۆکەی کوشتەوە. چایە لە دوای چایە تێدەکات. هەینێ کەسێ چایەی هەبا، شا بوو.

چەندێ گوتم: درەنگ دادێ، رێم نیشاندە، دەڕۆم.

بە بۆنی چەلاوی بارۆکە و چایە بەستمیەوە. خۆم بە عەرد دادا، نەیهێشت هەستم. چەندی گوتی:

زۆر رێبواری بەپەلەم دیوە، بەڵام هی وەک تۆ نا. چ راسپاردەیەکت لە گیرفانێیە و بۆ کێ؟

هیچم نەگوت. خودا لە دور دەوی خانەخوێی بەدڵ و چاوتێر بدات. من ئێستاش دەڵێم ئەو پیاوە لە چاومەوە راسپاردەکەی دڵمی خوێندۆتەوە. ئەویش داردەستی شا بووە، بۆیە گیری کردم.

نازانم لە چایەی چەندەم بووم، مانگ لە ملەکەی ئەوبەرەوە، لە شێوەی گڕی لەپڕی کۆلکەی داربەڕوو، دڕی بە تاریی ئاسمان و زەوی دا. ئەستێرەیەکیش نەرم نەرم هات، لە شێوەی گوجیلەیەکی درەوشاوە لە بەردەمم نیشتەوە. ئاماژەی رۆیشتنی کرد. دیتم کلکی تیشکاوێژی رادەوەشێنێ، ئاورم لێدەداتەوە، بە زمانی چاو و کلک دەڵێ:

وەرە، بە دوای مندا وەرە.

گۆتمە خانەخوێ:

+ماڵت ئاوەدان، رێم نیشاندە.

-رێ ئەوەتا لەو خوارە- دەستی بۆ رێی گوجیلە ئەستێرەییەکە درێژکرد- بەڵام بەو شەوە تاقە سوار بۆ کوێ؟ تۆ منداڵی ئەزموونی رێوبانت نیە. لە دەستی چەتەی خۆمانیش دەرچی، دەکەویە داوی جەردەی عەجەمەوە.

+ئەوشۆ نەگەمە ئەویٚ، دنیا ژێراوژوور دەبیٚ.

چ دوور نیە، دەرمانی خەویٚ، تۆ بلٚیٚ هی مردنی، بۆ لە شیویٚ کردبم. لە حیلەی ماینیٚ شینکە وەئاگاهاتم. تاهوواها! ئەوە چ کاتی رۆژە، خۆر هەر لە چیاوچۆل نا، لە زیندانێش هەلٚهاتووە. ماین سمکۆلاٚن دەکات. سەرەتا وا تێگەیشتم لە برسان، لە تینویێتیە. وا نەبوو، پەلەی بوو، بە چاو قسەی دەگەلٚ کردم:

تۆ لە کویێی؟ لەبیرتچوو، ئەدی هەرێت نەدابوو؟

ماین لە زینکردنیٚ، یارمەتیدام. زاری گەیاندیٚ و هەلٚیدایە سەر پشتی خۆی. بالٚمان گرت. لە دەروازەی رۆژاوایی، خۆم بە شاردا کرد. بە سەر قورپێواندا کەوتم. تێگەیشتم درەنگ کەوتم و وێرانەگەیشتم. تەرمەکەشیان بردبوو.

پیری پەنهانزان هەناسەبڕکێی پێکەوتووە. هەنسکان دەدات. هەستمکرد تینووە. قورگی وشکبووە. ئای بۆ چۆڕە ئاوێک، بە سەر لێویەوە بکەم. بەلاٚم زیندان لە بیابان وشکترە. پیاو هەیە بۆ دلۆپە ئاویٚ تاوانیٚ بە ملی خۆیدا دەهێنیٚ، دوور و نزیک دەستی تێدانەبووە. باش بوو پیری پەنهانزان

ناوی ئاوی بە زاردا نەهات و سواری ماینەکەی بۆوە و پێی لە ئاوزینگێ نا. پرسیم:

تۆ بۆ گێڕانەوەی گیانی ئەو کوژراوە هاتبوویت؟

نەیبیست و ئاوڕی نەدایەوە. پێدەچوو لە گێڕانەوە ماندووبووبێت. هەستمدەکرد، لە جێ جێ سەرهات دەپچڕێ و گرێی ناداتەوە:

کۆمەڵە شێرێکیان خستبووە پشتی ترومبێلێکی گەورەوە بە ناو شاردا دەیانگێڕان. سێ رۆژ گێڕایان. سێ رۆژ بە ناو جادەدا رایانکێشان. منداڵەورتکەی عەجەمان نەدەوێران زۆر لێی نزیکبکەونەوە، لە دوورەوە پەلە بەردیان تێدەگرتن... شا شایی گێڕا...، خۆ لە کەوتنە ناو بۆسەکە ئەگەر بۆ سەر لاشەی کوڕەکەی نەگەڕابایەتەوە، دەردەچوو، بەردەست نەدەکەوت... تەرمەکان وەها شێوێنرا بوون، نەدەناسرانەوە. ژنەکەی بە پەنجە بڕاوەکەی مێردەکەی ناسیبۆوە... سەری خۆم هەڵگرت. خۆم لە کەلاوەی دمدم دیتەوە. دوو سێ شەو لە ناو بەرد و پووشوپەڵاشی ئەوێ مامەوە. ماین لە دەورم دەخولایەوە و بەجێینەهێشتم. ناوە ناوە دەهاتە سەرم. دەمدیت وردە فرمێسکان دەبارێنێ، فرمێسکی گەرم خوێناوی. دەهات بە

نەرمـی لـچ و لێـوی لە شـانم گیردەکـرد. بە ئامـاژە دەیگوت:

سوارۆ، سواربە، با بچینەوە.

دڵی مـاینم نەشـکاند و خـۆم هەڵدایە سـەر زینـێ. ماین نازانم بۆچی ڕێی گەڕانەوەی گۆڕی و بردمیە دەروازەی (هەزاران) تـۆ بڵێـی بـۆ بیسـتنی لاوکەکە بووبێـت یـان... ژنێـک لە سـەر گۆڕێـک بە دەنگێکـی ژنانەی وا پیاوی دەتاواندەوە هەڵیکردبووە لاوک، چ لاوکـێ! پێـدەچێ لاوکبێـژەکە لەوەوە فێـرە لاوکـان بووبێـت. لەو لاوکەدا باسـی مـار و شـای دەکـرد، باسـی ئەوەی دەکـرد، کـاتێ مـار بە پەنـجەی کـوڕەکەی غەزالـی چـاو ئەسـتێرەوە دەدات، وەکـات خەنجەر هەڵدەکێشێ و پەنـجەی خـۆی دەبـڕێتەوە و ژەهر بنبڕ دەکات. بەڵام کاتێ شا پێوەیدەدات، ژەهر شـاهانە کـاری خـۆی دەکـات. لاوکەکە هەر دەبـێ ناوی ژەهری شا و مـار بـێ. گۆڕەکە گۆڕی کوڕی غەزاڵی چاوئەستێرەبوو. داخی گرانم نەمتوانی وەک جاری گۆڕین بیپارێزم و نەهێلم بکەوێتە داوەوە.

+کام جاری گۆڕین؟

پیـری پەنهـانزان بـوورایەوە، تەخـت بـوو، بەڵام چـاوی دەدرەوشـانەوە. هەسـتمکرد چـاو نـین و جـووتێ ئەسـتێرەن. دوو سـێ میـرغەزەب هـاتن و بردیان. ئیدی نەمدیتەوە.

## ٤

قـامچیم دانەهێنـابۆوە، لە سـەر سـینگی پیـرە ئەسـتێرە درەوشـایەوە. نەمزانـی لە کوێـوە هـات. پێدەچوو لە بـاخەڵی هەڵیگرتبێـت. نـاوی سـەرۆکم لێهێنا و وەرگەڕامە سەر ئەستێرە. من ئێستا شێتانە قـامچی رادەوەشـێنم و چـاوم نـابینێ بەر چ شـتێ دەکەوێ. گوێم نابیستێ، دەنگی چ شتێ دێ.

چەند رۆژێ، بە رۆژ دەچوومە دارکاریی پیرە و هەمـوو جـارێکیش ئەسـتێرەکە پێش مـن دەگەیشـت. بەڵام لە ترسی گیانی خۆم، ناوی سـەرۆکم لێدەهێنا و وەردەگەڕامە سەری. شـەڕی ئەسـتێرەم دەکـرد و دەست و پێی خـۆم نەدەدیت. لە هـیکەوە وەک بڵێی هەسـتی بیسـتنم بـۆ گەڕابێـتەوە، لە ئەسـتێرەوە، تـۆ بڵـێ لە پیـرەوە دەنگێـک هـات. شـتێکی دەگـۆت، رستەکەی پێشتر نەبوو. حەیف و مەیفی تێدانەبوو. وەلێ تێنەدەگەیشتم چ دەڵێ.

دەسـتێکی ئاسـنین شـانمی راتەکانـد و رایکێشـامە دەرێ. گوتی:

تــۆ دەتەوێ گیــان، یــان قســەی لێــدەربهێنیت؟ نابیستی دەڵێ قسەدەکەم؟

پیرە پشیلەی حەفت گیان هاتە گۆ:

منداڵ بــووم، تــازە خەتــی ســمێڵم دانــابوو. ژنێکــی چەقــۆ بە دەســـــت هـــاتە خەونـــم. بە دەم چەقـــۆ تیژکردنەوە دەیگۆت:

خــوێنی برایــێ مــن ئــاو نــیە، وا بەلاش بــڕوات. سورما نەبم ئەگەر تۆڵەی نەکەمەوە.

پــێش خەونەکەش دڵــم تریوانــدبووی، دەمزانـــی پیلانێکی گەورە لە ئارایە. ئەمن زانیبــووم برایەکی ئەو ژنە کــــوژراوە. بکــــوژەکەش ئێســــتا بــــارگەی هێناوەتە بن شار. دڵم گۆتی، وا بەڕێوەیە و بە پێی خۆی دێتە بن چەقۆ.

دڵ نەبوو، ناوی بڵێ، کێ بوو؟

گــوێی نەدایە پرســیارەکە و درێــژەی بە گێــڕانەوە دا:

لە خانەکەی بن قەلاتێ نێرەکەرێکم بە کورتــانەوە دزی. بـــاژۆ، بەر لەوەی لە شـــــار نـــزیکبکەوێتەوە، دەبێــت بیگەمــێ و وا بــکەم یەکپــێ بە رێــی خۆیــدا

،گەریــتەوە و نەکەوێــتە داوەوە. نێــرەکەر لە مــن
ا...ـتر رێــی پێــدەزانی. بــاڵی گــرت، لە ئاقــاری مــاڵی
ەلان تووشی کاروان بووم. لە دوورەوە ناسیمەوە.
اە خەونێش نەمدیتبوو. بە کڵاو و ڕەخت و فیشەک
اسـیمەوە. کــوڕەکەی غەزالــی چــاو ئەســتێرەم
اســیەوە. تــا ئێســتاش ئەو لە کەس نەچــووە و
کەسیش لەو نـاچێ. یەک دوانێک نەیاندەهێشت لێی
نزیکببمەوە. فەرمانی دا، وازم لێبێنن. چاوی لە چاوم
بڕی و گوتی:

+ کــوڕێژگە، وا پێــدەچێ بە هەواڵــی ناخۆشــەوە هاتبی؟

– ئەزبەنــی، پــێ نەخەیــتە شــارەوە، لە ئینگلیــز دوورکەوە.

+ کێ تۆی نارد؟

لەو ســاتە یەک دوو فــڕۆکە پەیــدابوون. چــاو و لوولەی تفەنگی بڕیە ئاسمان.

فڕۆکە بۆردومانی کردن؟

پیرەی حەفت گیان، پیری پەنهانزان دەگێڕێتەوە و وەڵامی چ پرسیاران ناداتەوە. خۆی تێکنادات، دەڵێی

له دیوەخـــانی بکـــوژەکەی بـــرای ســـورماخان دانیشتووە و داستانان دەگێڕێتەوە. پێ لە سـەر پێ دانیشتووە. دەستی چەپی بەسەریەوە، پەنجەکانی بە سـەری پەنـجەی دۆشـاومژەی تەق تەق لە سـەری دەدات، وەک بڵێی سـەربردە بەبیرخـۆی بهێنێتەوە. دەستی راستیشی بە پیاڵەوە هێند بە تام فڕیدەکات، حەزدەکەیەت لەگەڵـی بخـۆیتەوە. زوو زوو چـایە نوێدەکاتەوە. دەڵێی لە چاخانە دانیشتووە، بە سەری پەنـجە ئاماژەدەکـات، فەرمـان دەکـات، چایە بێت. بە فەرمـانی ئەبـوو عەلا ئەو پیـاوە هەرچـی ویسـت، وەکات دەبێت بگاتە بەردەمی. پێیگوتم:

ئەگەر داوای ژنەکەشتی کرد، بێ سێ ودوو بۆی دەهێنێت.

فەرمـــان لە ســـەری ســـەرەوە هـــات. ئـێمە لە سەرمانە بەرگەی ئەو پیرە بگرین کە هـاتۆتە قسـە. ئەگەر رۆژی نیو رستەش بڵێ پێویستە بە دیاریەوە دانیشـین. ئەگەر حەفتەیەک قسـەی بە لاڕێدا بـرد و جغارەخۆرێـک هـــاتەوە ســـەر خەت، لە ســـەرمانە بێدڵی نەکەین و گوێی بۆ رادێرین:

جگە لە چەتەی نـاوەخۆ، شـەش دەوڵەت بە دوای کـوڕی غەزاڵـی چـاو ئەسـتێرەوە بـوون. هەسـتیشـی

پێنەکردبوو، وای دەزانی تەنێ عەجەم بە خوێنی سەری وی تینوون. بە چ بزانێ، ئینگلیز کە لە بنی دنیاوە هاتوون، لە بن قەلاتێ داویان بۆ داناوەتەوە. ئەوەتا بە پێی خۆی دێت و بە داوەوە دەبێت، بە دەست دەیگرن و بە دەست و پێ بەستراوی دەیبەنە پێش سورما خان و دەلێن:

ها، ئەوە جەمی ئەورۆ، ئەوە ئەو چەتەیەی برا نوورانیەکەی تۆی لە هیچ و خۆڕا لە خوێن گەوزاند.

سورما وەک لە خەونەکە دیتم، چەقۆ تیژەکەی دێنێ. پشک پشک گۆشتی لێدەکاتەوە، دەیخاتە ناو تلیانەوە، وەک لە خەونەکە بیستم. دەلێ:

گۆشتی باشت پێوەیە، بەشی دەرودراوسێ دەکات.

لە خەونەکە گەورەی شاریشم دیت، تی کردمەوە و گوتی:

هیزە، بیگەیێ، چاوم بەرایی نادا، هاوخوێنی خۆم بە بەر چاومەوە بە دەستی نەیاران خوێنی بڕژێ.

گەیشتمێ، بە قسەی کردم و بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە و دایەوە چیا. دەستەڕاستەکەی دەیویست منیش لەگەڵ خۆیان ببات، بەڵام ئەو کیسەیەکی گچکەی دامێ و گوتی:

گچکەڵ، بە گیان قەردارتم. بڕۆوە ماڵێ، هەر خەونێکی وات دیت، ئاگادارمبکەوە.

لە گەڕانەوە پۆلیس گرتمی. بردمی و لە ژوورێی کردم، لێدە و لێدە. ئەمن بیرم هەر لە کن خەونەکە بوو. هێندەی نەمابوو پێلێبنێم و هەموو شت بە گۆڕێ وەرکەم. پۆلیس دەڵێ:

کەرت بۆ چی بوو، بۆچی دزیت؟!

تاهوواها! کەرم لەبیرنەمابوو. خوا بۆی هێنام و گوتم:

نەمدزیوە، حەزم لە سوارسوارێنێ بوو، ئەوە نیە هێنامەوە.

پۆلیسەکە زللەیەکی دی خێواندمێ و پرسی:

ئەدی ئەو جۆرکە پارەت لە کێ دزی؟ ئەویش بۆ شاباش؟ دوایی بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێنیتەوە؟!

نەمزانی چ بڵێم، بۆم هات و گوتم:

پارەکەم لە رێ دیتەوە، دەمویست بیبەمە مزگەفتێ و بانگەواز بکەم.

پۆلیس دیاربوو پیاوێکی باش بوو، باوەڕی هات. پارە و کەری لێم گێڕایەوە و بەرەڵلای کردم.



هەر من نا، زۆر لە بەندییانی بەندیخانە هەستیانکرد پیری پەنهانزان رووخاوە و هەموو شت دەڵێ و بە دڵی (ئەمن) قساندەکات. داخوا سەری چەند کەس لە قوڕێ دەنێ. من سووکە سەلامێکم لەگەڵی هەبوو، ماڵیان لە نزیک هێلی شەمەندەفەر بوو. پیرێکی زۆر شیرن دیار بوو. تامەزرۆ بووم، پتر لێی نزیک بکەومەوە. بەڵام ئێستا لەو ناسینە دووربەدووریەش پەشیمانم. دەترسم لە خۆوە ناوی منیش بڵێ. ئەرێ دەیزانی من ناوم چیە؟ خودایە، ئەگەر زانیویەتیشی لەبیریچووبێتەوە. ناوم بدات، کێشەکەم تیرتر دەبێت.

ئیدی هێندەی لەو پیرە دەترسام، لە ئەمنەکان نەدەترسام. یەک دوو جار لە کەلێنێکەوە دیتم، لە سەر کورسی دانیشتووە و پیاڵەی چا بە دەستەوە

و زاری دەجـوولا. لەپـڕ بزربـوو، ئـازادیش بـووم نەمدیتەوە، ناویشـم نەبیسـتەوە. ئەوە ئێسـتا لە ڕێی ئێـوەوە ئەو پیـاوە دێـتەوە نـاو قسـان و دەزانـم گـرتنەکەی پەیوەنـدی بە پیـاوی نـاو ئایەتـانەوە هەبووە.

## ٥

پیری لاوک ئەرکی زۆر گران بوو. زۆر جار داوای لاوکی دەکرد، نەدەبوو بێدڵیی وی بکەین. دەنگگرێک بۆ لاوک و ئەوی دی بۆ تۆمارکردنی سەربردەی ئەو. ئەگەر نەوارەکانتان دەستکەوتەوە، دەبیستن لەگەڵ قسەکانی وی دەنگی لاوک دێ. ئەو پیاوە تا تێر نەبا لە لاوک، ورتەی لێوە نەدەهات. دوایوە دەبووە رووباری گێڕانەوە، ناوە ناوەش دەیگۆت:

حەیف، ئەو لاوکەی جارێک بیستم، نەمبیستەوە، کەس نەیبیست.

پیری پەنهانزان بە لاوک رانەوەستا، ئەی رەقیبیشی ویست.



رۆژەکی لە رێی هۆدەی ئەشکەنجە، لە هیکەوە لە دەرگایەکەوە ئەی رەقیب بەرزبۆوە. ئەمن وا تێگەیشتم میللەت رابووە و بە سەر (ئەمن)یان

داداوه. گۆتمەوه، ئەی رەقیبم گۆتەوە. پشتەدەستێک ئاگری لە چاوم کردەوە. زاری پڕ خوێن کردم. ئەها، هەوکەش کەلۆسم. لە سەر ئەی رەقیبێ دوو ددانم لە سەر دانا. دوو ددانی وا بە زێڕی دنیا ناکێشرێن. ئەگەر دەمزانی ئەوها دەبوو!

زیندانیەکی هاوڕێم خۆی لە سەر ئەی رەقیب گیرابوو. نەواریان لە دەست گرتبوو. گوتی:

منیش گوێم لەو ئەی رەقیبەی ناو زیندانێ بووە، شتێک لەوەدا هەیە، تێناگەم.

نە من و نە ئەو تێنەگەیشتین. ئەوە ئێستا دەزانم بۆ پیری پەنهانزان بووە. بیبینمەوە، دەڵێم:

دوو ددانم لە تۆ دەوێتەوە.

*** 

لە سەر فەرمانی ئەبوو عەلا ئەگەر پێویست بکات، بە زاری خۆشمان ئەی رەقیب بۆ پیری پەنهانزان دەڵێین. پیرە سەربردەی زۆر دوورودرێژ دەکردەوە. لە لاوکەوە بۆ ئەی رەقیب، لە دمدمەوە بۆ ئێرە، لە یانەوە بۆ مزگەفت، تا گەیشتەوە پیاوی ناو ئایەتان، تەمەنێکی پڕی ویست. ئەگەر رۆژێک

ئەو نەوارانەتان دیتەوە کە سەربردەی ئەویان بە دەنگی خۆی تێدا تۆمارکراون، هەینێ دەزانن، ئەوەی من دەیگێڕمەوە گۆلمێکە لە گۆمێک. جار هەبووە ریکۆردەرمان داناوەتەوە، پەرداخێک چامان لە پێش داناوە و بەجێمانهێشتووە. پیری پەنهانزان بە گێڕانەوەی گرتووە و چاو ناگێڕێ دەورووپشتی چۆلە یان ئاوەدان، خۆی تێر دەکات لە ئەی رەقیب. ئەوجا سەربردەکەی دەگێڕێتەوە:

ئەو ساڵانەی لە بەغدایێ بووم، دیجلە هەواڵی وڵاتی شاخاویی بۆ دەهێنام. هەواڵی رووداوی پێش روودان. دەچووم، جاروبار دەچووم، بە دیاریەوە دادەنیشتم. بە دیار شەپۆلەکانیەوە دادەمام و لەهیکرِا دڵم دەیتریواند. دیجلە وێنەی ئەو کەسەی نیشاندەدا کە نەیار لە گژن لەناوی ببەن. دیجلە لە شەپۆلەکانیدا شێوەی پیلانەکەشی نیشاندەدا.

پایزە، کزەبایەکی کوێستانی لە دیجلەوە دێ. پەلە هەورەکان دەڵێی مێگەلن گورگ لێی داون، پەرتدەبن و خڕدەبنەوە. هەر یەکەی بە لایەک، لەو سەری بەغدایێ هەندێکیان وێکدەگەنەوە. بە دیار دیجلەوە رۆیشتووم، پێچەوانەی وی رۆیشتووم. لەپڕ شەپۆل وێنەیەکی بە دیارمەوە راگرت. زوو ناسیمەوە، پێش

چــوار پێــنج ســاڵێ لێــره لەو کەنــاره دیتــوومە. بە کتێــبەوه دەهـــاتە ئێــره، هەوه، ناســیمەوه، کــوڕە ســەرگەردانەکەیە. ئەوەی بەهــیە خــان لە نــاخەوە ســەرگەردانی کــرد و لە رووکــار بە ســەر خــۆی نەهێنا. هەوه، وێنەکەی ناو دیجلە، سەرگەردانەکەی (خەندەکەی بایی)یە. ئەو خەندەیەی تەنێ من دەزانم چ خەنــدەیەکە، بــاییەکەش چ بــایی! جــارەک ســت بەهــیەم لە کەنــاری دیجــلە دیتــووه. لە خەنــدەی ئەوەوە پەڕ پەڕ، پەڕە گــوڵ بەردەبــوونەوە و بــا لە کەنار دەیگێڕان.

پیری پەنهانزان چیرۆکی پیاسەی بەهیەی کەناری دیجــلەی لە دیجــلە درێژتــر کــردەوه. ئەبــوو عەلا ســـەردانی بەغــدای کــرد و هـــاتەوه. ئەو هێشـــتا نەگەیشــتبووە نیــوەی، چەنــدان نەواری بە بەهــیە و خەنــدەکەی بــایی پڕکـــردەوه. زۆری پێچــوو تـــا گەڕایەوە لای وێنەکەی ناو دیجلە:

رێی بەغدا کــاول بێ، خــۆ نــابڕێتەوه. لەوێوە بۆ ئێره دوو شامەڕێ دەبێ. لە چیاش گزنگی نەدابوو، مــن لە رێ بــووم. دامنـــابوو، ســەر لە ئێــوارەکەی بــگەمە ئێــره. بەڵام چ دەکەی لەگەڵ ئاســن، لە دوو جــێ ترومبێــل پەکــی کەوت. جــاری دووەم لە بــن

حەمرین، بە دیوی بیاباندا پەکی کەوت و بە گەڕ نەکەوتەوە. من دەبوو بەر لە ماڵنووستنان بگەمە ئێرە و نەهێلم دەو لەو سێ چوار پشکە گۆشتە بدات. رۆژی دوایی گەیشتم و بە بن دارەبازەکەی راگەیشتم.

پیری پەنهانزان بە ئاماژە داوای چایەی کرد. چایە هات. هەر بە ئاماژە تێیگەیاندین کە ماندووە و پاشماوەی وێنەکەی ناو دیجلە با بۆ سبەی شەو بێت. ئەو پیاوە تەنها بە شەو زاری دەکردەوە. بەشەو ئاوی گێڕانەوەی دەهات و نەدەبڕا. بەڕۆژ دڵۆپە وشەیەک لە زاری ئەوەوە بەرنەدەبۆوە. بردمانەوە هۆدە تایبەتیەکەی خۆی، لە سەر پشت راکشاو لە بن لێوانەوە گوتی:

حەیف، ئەستێرەکەی قەلات رژا، کوشتیان.

قسەکەیم بۆ ئەبوو عەلا کردە عەرەبی. سەری بادا و گوتی:

ئەو سەی کوڕی سەیە، درەنگ دەگاتە سەر بابەتی ئیمە، بەلام دەبێت ئارام بگرین.

پیری پەنهانزان لە زیندانێ زمانی عەرەبیی لە بیر خۆی بردبۆوە. کوشتبات ناوی خوداشی بە عەرەبی نەدەگۆت و بە کوردی دەیگوت:

ئەز عارەبی نازانم.

لە سەر ئەوە زۆر لێی پڕ دەبووم و دەهاتە سەرم خۆم ئاشکرا بکەم و بڵێم: ئەدی تۆ نەبووی لە پێش دەرکەی بە عەرەبیەک قسەت دەکرد لە هی من جوانتر؟

نهێنیی عەرەبیی زانینی پیری پەنهانزانم لای خۆم هێشتەوە و لای ئەبو عەلاش نەمدرکاند. ئەو شەوە لە شەوە ترسناکەکانی ژیانی منە. لەهیکرا لە هەموو لا ئەستێرە هەڵدەبوون. بەندیخانە بووە ئەستێرەخانە. ئەستێرە ئاوی چاومیان برد. بە لەپگێڕان دەرگام دیتەوە. یەکپێ گەڕامەوە ماڵێ. دەبینم پیری لاوکی ئێوە وا لە سەر کۆسپەی دەرگا دانیشتووە. هێندەی نەمابوو لە بانگ بدەم. لە ترسان بسمیلایەکم بە سەر زاردا هات. وەکات پیری لاوک بزربوو. ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم. تێگەیشتم لەگەڵ کەسێک تێکەوتووم، ئاسایی نیە.

## ٦

لە پێش دەرگای سینەما نەوارەکەم لێیوەرگرت، لە بن دیواری یانە گرتمیان و بردمیان:

چیە؟ چ بووە؟ بۆچی دەمگرن؟

متەقیان نەکرد، نەوارەکەیان لە گیرفانم دەرهێنا و هەر یەکەو پیلێکیان گرتم و بە رێی خۆمدا گەڕاندمیانەوە. تۆ بڵێی بمبەنەوە پێش دەرگای سینەما؟ نا، پۆلیسخانەیەک کەوتۆتە ئەو نێوانە، نێوان سینەما و یانە، لەوێ نەوارەکەیان خستە سەر ریکۆردەر:

ئەی رەقیب هەر ماوە...

قەوما، دەستمیان لە پشتەوە بەست. چاومیان بەستەوە. بە مست و پێلەقە خستمیانە ترومبێلەوە. هێند تیژ دەڕۆیشت لە پێچکردنەوە هەستمدەکرد ترومبێل دەکەوێتە سەر دوو تایە و تەواو لار دەبێتەوە. حەزمدەکرد وەرگەڕێ و من بە ئەوانەوە تیابچم و کونەڕەشی (ئەمن) نەبینم. بۆیان

باسکردبووم، چ دۆزەخێکە. ترۆمبێل وەرنەگەڕا و ئەو جێیەی زراوم لێی چووبوو، دیتم .

ئەی رەقیبەکەی من یەک ئەی رەقیب نەبوو. نەوارەکە چوار پێنج ئەی رەقیبی تێدا بوو. هەر یەکەی بە دەنگی ئەی رەقیبێژێ. یەک لەوانە دەنگی خۆم، بە شمشاڵەوە تۆمارم کردبوو. بە قسەی برادەرەکەم بێت لە هەمووان خۆشتر بوو.

بەوەی باش بوو، ئەمنەکان دەنگی منیان نەناسیەوە. ئیدی هەر ئەی رەقیبێک ئەشکەنجەی خۆی هەبوو، پرسیاری خۆی هەبوو. بەڵام ئەو پرسیارەی لە دوای هەر پرسیارێک دەبۆوە پرسیار و دەیانپرسی:

ئەو نەوارەت لە کێ وەرگرت؟ بۆ کێی دەبەیت؟

وەلامی منیش:

لە هیچ کەسێکەوە بۆ هیچ کەسێ، لەو گۆڕە دیتمەوە.

ئەی رەقیب سێ ساڵ لە زیندانی هێشتمەوە. هەزار جوێنم بۆ ئەی رەقیبنووس و ئەی رەقیبێژان ناردووە. تۆ بزانە بەو چەند وشەیە تووشی چ

دۆزەخێکیان کردم. بن پێم هاتۆتە سەر پێم. چاوێکم هەر زوو ڕۆیـــی. بینـــاییم ڕژایە بـــن پـــێم و هەڵنەگیـــرایەوە. لاشـــانێکم دەرپەڕی و ئێســـتاش نەهـاتەوە جێ. لە نـاو مێشکیشـم ژاوەژاوێـک هەیە، دکتۆرە ئەمریکیەکەش تێنەگەیشت چ باسە.

لە بـارەی زینـدانەوە زۆر شــتم بیسـتبوو. بەر لەوەی بیبیـنم دەمزانـی چەنـد جـۆر ئەشـکەنجەدان هەیە. لە کارەبا لێدانەوە تا دەگاتەوە بوتڵ تێوەکردن و بوتـــڵ پێـــوەکردن. لە بـــارەی ئەشـــکەنجەی دەروونیشـەوە هەمـوو شـتێکم دەزانـی. بـۆیە هەر ئەشـــکەنجەیەک دەهـــاتە پێشـــێ، خـــۆم بـــۆی ئامادەکردبوو. وەک بڵێی ئاشنایەتیم لەگەڵی هەبوو. بەڵام چەنـــدی ســـەرم دەهێنـــا و دەبـــرد، لە ئەی ڕەقیبەکەی خۆم تێنەگەیشتم. ئەوەی بە دەنگی خۆم و شمشاڵەوە بۆ پیرەمێردەکەیان لێدەدا. ئەوە نوێ بـــوو. شـــتی وام لە هـــیچ هـــاوڕێ و ناســـیارێک نەبیســتبوو. لە هــیچ کتێبێـک نەخوێنـدبۆوە. مــن چ بزانم.



ئەبـوو نەجـم لە گێـڕانەوەی ســەربردەی پیـری لاوک، هەقـایەتخوانێکی کەم وێـنەیە. هێنـد شــیرن

دێتەگۆ، دەمخاتە گومان. گومان لەوەی ئەو پیاوە قامچیوەشێن بووبێت، زوو زوو دەڵێت:

تا نەوارەکان نەبینەوە و سەربردەی پیری پەنهانزان لە زاری خۆیەوە نەبیستن، تامی سەربردەتان نەکردووە.

نەوارەکان رەنگە نەبینرێنەوە. شتی وا بکەوێتە دەست هەواڵگریی ئەمریکی، دەستی لێ بشۆ. دەڵێمە ئەبوو نەجم:

+ تۆ دەنگی پیری لاوکت نەپاراست، بەڵام من دەنگی تۆ دەپارێزم.

- بیپارێزە، بەڵام تکایە، ناوم بە دنیادا بڵاونەکەیتەوە، دەمکوژن. هەرگیز هێندەی هەوکە لە مردن نەترساوم.

ریکۆردەرەکەم دانایەوە و پرسیم:

+ لە پیری لاوکت نەپرسی چەند دەوڵەت و لە کەیەوە بە دوای ئەی رەقیبەوە بوون؟

- با، سەرو ریشی دەستکردم بۆ خۆم دانابوو، چاویلکەی گەورەی رەشم لە چاو بوو، دەنگی خۆم کەمێک گۆڕی، ئەوە تۆ بە ئاشکرا نەوارت دانایەوە،

بەڵام مــن بە دزیەوە دەنگــی ئەوم تۆمــاردەکرد و پرســیم، ئەویــش دوای چەنــد جغــارەخۆرێ، مــن پرســیارەکەی خــۆمم لەبیرنەمــابوو، گەیشــتە ئەو جێیەی وەڵامی پرسیارەکەی من بوو:

لە سەردەمی کۆمارەوە هەر سێ دەوڵەتی عارەب و تـورک و عەجەم لە ئەی رەقیـب بە رقـدا چـوون. ئینگلیزیش دژی وەستا. دکتۆرە ئینگلیزەکە دەستی هەبوو لە ژاراویکردنی سێ چوار پشکە گۆشتەکە.

ئەبوو نەجم هەوڵدەدا ئاخافتنەکانی پیری لاوک بە دارشــتنی خـۆیەوە، چـۆن بـووە ئەوهـا بگێـرێتەوە. رەچــاوی هەڵبژاردنــی وشــەش دەکــات. هەتــا لە گـۆکردنی وشــەش دەیەوێـت دەمەلاسـکەی پیـری لاوک بکـاتەوە. لە پیـاڵە بە دەسـتەوەگرتنیش خـۆی دەکاتە پیری لاوک و دەڵێ:

گـوو بە ترومبێـل، لە بەغـداوە بە سـواری ئەسـپ هاتبــام لە کــاتی خـــۆی دەگەیشـــتمە ئێـــرە و نەمدەهێشـت دەسـت بـۆ پشـکە گۆشـتەکە ببـات. شاعیری ئەی رەقیبم لە مردن رزگار دەکرد و ئەی رەقیبەکەیتری دەنووسیەوە.

پیری پەنهانزان فڕێکی درێژی لە چایەکەی دا و جغارەیەکی پێکرد و پێی خستە سەرپێی:

قسە گەیشتبۆوە بەغدا، ئەو کوڕە سیسە، ئەوەی لە ناو دیجلە دیتم بە پێی خۆی بۆ یانەی مەرگ دەچوو، بە تەمای شتێکە. کار لە ئەی رەقیب نیە، بە بیستنی شار دێتە ناو شەقام و شەپۆل دەدا. ئەودیوی حەمرین بە سەر بەغدادا کاول بێت، ئەگەر لەوێ ترومبێل پەکینەکەوتبا، من ئەو شەوە دەگەیشتمە یانەی فەرمانبەران و سەرم دەخستە بن گوێی و دەمگوت:

ئەوشۆ هەر خواردنێکت هاتە پێشێ، دەستی بۆ نەبەیت، ئیزرائیلی تێدایە.

هێی! ئەو شارە بۆتە شاری مزگەفت و غافڵکوژی. مزگەفت پیاوی ناو ئایەتانی کوشت، دەنگە داودیەکەی شوونبزر کرد، چەندان ئەستێرەی رژاند.

+ کام دەنگ دەڵێی؟!

پیری پەنهانزان خەوی هات و کپ کەوت، بەڵام نەکوژایەوە. لە دەمی خەوتنێش دەمدیت ئەستێرە دەوری دەدەن.

## ٧

پێشـــترێ لاوكـــی نـــا، نـــاویم بیســـتبوو. هەر ئەو جلـــكەی لەبەرە كە لە وێـــنەكە لەبەریەتـــی. هێنـــد كزومەلـوول دیـارە، دەڵێـی دنیـای بە سـەردا وێـران بـووە. مـن لەو سـەرەوە دانیشـتووم و تیچـاوێكم لە ســـەریەتی. لە هیكـــرا تێیهەڵكـــردە لاوك، چ لاوكـــێ، نیوەی بەغدای لە پێش چاخانەكە خڕكردەوە، باڵدار لە سەر سەری كەپرۆكەیان كرد.

قسەم بە ئەبوو نەجم بڕی:

+ مەبەستی لە دەنگە داودیەكە ئەو لاوكبێژە بوو؟

– منـــیش ســـــەرەتا بەوی تێگەیشـــتم. بەلام نـــا، كەسـێكیترە. پەلە مەكە بـۆ گەیشـتن بە داود. بە پێـی پیری لاوكـی تـۆ دەڕۆیـن. بـا لەو سـەری لاوكەكەوە بگەڕێتەوە:

خـــوایە، ئەو لاوكبێـــژە كێـــیە؟ لە كوێـــوە هـــاتووە؟ كـــاتێ عەلـــی فلەیـــیح و پیاوێكیـــدیم دیـــت بەرەو لای

هاتن، شکێکم کرد. ناوی هێنا، هەوبوو، پیاوەکە گوتی:

بەیزافۆن لێرەوە تا قەڵاتێ داوای لێبووردنت لێدەکات. هەستە. ئێستا دەچین تۆماری دەکەین.

لاوکبێژ دیسان زمانی گیرا. تا دوو سێ پەیڤی گۆت، دوو چایەت دەخواردەوە. ناسیمەوە، هەوە، لاوکبێژەکەیە. ئەوەیە کە بیستبووم جاروبار دەچێتە چاخانەکەی فلەییح و لاوکان دەڵێ. کاتێ ئەو دەنگ هەڵدەبڕێ، هەرچی باڵداری شارە، لە ئاسمانی قەڵاتێ باڵ لێک دەکەنەوە و سێبەری لێدەکەن و هەناسە لە خۆ دەبڕن.

بەڵام چ دەکەی لە دەرێی لاوک و حەیران و بەستە زاربەستەیە. زمان دەگرێ و دوو وشە وەک خۆی گۆناکات. هەر لەبەر هەندێش بووە عەلی نەیوێراوە بیباتە ماڵی بەیزافۆن. ترساوە لەوێ زمان بگرێ و شەرمەزار بن، وەک گیرا.

لەوێ ویستبوویان بیدوێنن و پرسیاری لێ بکەن و تاقیبکەنەوە، داخوا دەنگی ئەوە دەهێنێ بچێتە سەر قەوان. لاوکبێژ زمانی تێکدەئاڵێ و چەندی

هەوڵدەدات تێیانبگەیەنێ کە واز لە قسە بهێنن و یەکسەر بچنە سەر لاوکان. گوێنادەنێ و دەڵێن:

برۆ بابە، برۆ چما قەوان هەوەنتەیە، بە پرتەپرتی تۆ خەساری بکەین.

بەوەی باش بوو، لە پەنجەرەی بەیزافۆنەوە گوێیان لێبوو. پەژیوانبوونەوە و بە مەمنوونیەوە هاتن بە دوایدا و بەڕێزەوە بردیان. منیش لەگەڵیان چووم. بە دیار منەوە (گەنج خەلیل)ی خستە سەر قەوان و یەک دوو جاریش گۆتی:

لە چاوی عەلی فلەییح.

خۆم پێناگیرێ و هەڵدەدەمە قسان و دەڵێمە ئەبوو نەجم:

پیری لاوک راست دەڵێ. ئەو پیاوە لە ئاخافتنێ زمانی دەگرت. تا رستەیەکی کورتی گۆدەکرد، دەچوویە رێیەکی درێژ و دەهاتیەوەش. کێ باوەڕدەکات لە لاوک گۆتنێ زمانی وی لە با دەچێت و ساتمەناکات. ئەوە رازێکە بۆ خۆی.

ئەبوو نەجم گۆتی:

پیری پەنهانزان ئەو رازەشی درکاند و شەوی دواتر تێهەڵچۆوە:

رازی ئەوەش بە قسەی ژنەکەی بێت، لە بەفرەوەیە. بەفر زمانی ئاخافتنی لەنگکرد و بەفر وایکرد زمانی لاوکی لە شەماڵەوە وەربگرێت. بەر لەوەی لە رێی ئاشێ بن رەنووە بەفر بکەوێت، ئەو مێرمنداڵە لە ئاخافتنێ بولبول بوو. بەڵام نە دەنگی لاوکی هەبوو، نە چ لاوکێکی دەزانی. دوایەوەی فریشتەیەک گەیشتێ و لە بن رەنووی دەرهێنا و بە فووێک وشکیکردەوە و ناردیەوە لای دایکی، ئەو لاوکبێژەی لێدەرچوو.

پیری پەنهانزان هەناسەیەکی ساردی تیشکاوی هەڵکێشا، دەتگوت لە بەفرەوەیە و گوتی:

داخی گرانم، لاوکێک لە دەستچوو، چ لاوک، وەک ئەوەی نەتەوەیەک لە ناخەوە بە یەک دەنگ بیڵێتەوە، لاوکێک...

بە دەم چایە و جغارەوە:

بەیزافۆن خەنی بوو. نانی کەوتە لاوکان. قەوانی وی بەبەرنەدەکەوت. قەوان شارە و شار چاخانە و چاخانە، ماڵە خواپێدا و خواپێداو دەڕۆیشت.

خەڵکوخـوا لە خـڕ لاوە لە قەوان خڕدەبـوونەوە. بە دیارە ئەو دەنگە چیاییەوە هەناسەیان لە خۆ دەبڕی. لە نـاو لاوکـان لاوکـی مەلیکـۆ، ئەوە نـاڵێم کە ئێـوە دەیـزانن، هەرای نـایەوە. نـرخەکەی چـل قـات بۆوە. پۆلیس لە نیو درهەمەوە گەیاندیە دینارێک.

پۆلیس؟!

لەو جێیەی من پۆلیسی پرسیارم هـاتە سـەر زار، رێـک لەو جێـیەش هەمـان پرسـیار بە زاری ئەبـوو نەجیمیشدا هاتبوو:

پۆلیس؟!

پیـری پەنهـانزان گـوێینەدایە پرسـیارەکە، نەرمە کـۆخەیەکی کـرد. لەگەڵ کـۆخین، تیشـک بە سـەر سینگیدا پەرتبوون. بە سەر پۆلیسەکەدا بازی دا:

لە گەرمـاوێ هـاتمە دەرێ. قەدی قەڵاتـێ بەفـری گرتبوو. لە ناو بەفرێ ئاوێنەک تیشکی لە چاوم دا. رەنـگە هەر بەفـر بووبێـت خـۆی لە مـن کـردبێتە ئـاوێنە. لە نـاو ئـاوێنەوە وێـنەیەک بە روونـی دەرکەوت. زوو ناسـیمەوە، لاوکبێـژەکەیە. دڵـم تریوانـدی. تێگەیشـتم شـتێکی بە سـەردێ. وێـنەکە گەورەتـر و روونتـر دەرکەوت. جێـی

داودانانەوەکەشی نیشاندا. ناسیمەوە ئاواییەکەم ناسیەوە. خوایە بەو بەفر و ڕێبەندانە چۆن بگەمە ئەویّ. لێرە هێندە بەفرە کەوتبیّ، لەویّ لە نیو بەژنی کەمتر تێنەکردووە.

پیرە ئەسپێکم پەیداکرد. خۆزگە بە دزینیش با بە ئەسپێکی باش لە بەفرم دەدا. ملی ئەو ڕێیەم گرت کە پێش چەند ساڵێک بە سواری نێرەکەرێک پێیدا چووم و نەمهێشت کوڕی غەزاڵی چاو ئەستێرە بکەوێتە داوەوە. چەندی لە شار دوورتر دەکەومەوە، بەفر ئەستوورترە و لێناکاتەوە و دەڵێی پارچە پەڕۆیە دێتە خواریّ. باژۆ، دەبێت بگەمیّ، نەهێلم دەنگە چیاییەکە بە دەستی ئاغۆکەی ئاخوڕی قیرەبڕ بکریّ. بەفر ناوە ناوە لێدەکاتەوە. دنیا سپی سپی، زەوی ڕەشاییەکی پێوە نەماوە. جگە لە من و پیرە ئەسپ گیانلەبەر لە دەریّ نیە. بەفر تێدەکاتەوە. ئەسپ لە ڕووبارە گەورەکە پەڕاندمیەوە.

پێدەچیّ دەمەو ئێوارە بیّ، پێدەچیّ ڕێشم هەڵەکردبیّ. لەو ڕێیە چەند گوندێک دێنە ریّ. دووکەڵێکم نەدیت، حەپەی سەگێک نەهات، سەرباری ئەوەش ئەسپ کەوت. نە بە تکا و قسەی

خـــۆش، نه به هەچه و نەقیـــزە، له جێـــی خـــۆی نەبزووت. چەندی گوتم:

خۆت گورگان خواردوو مەکە، با بڕۆین.

به گوێیدا نەچوو. ماڵاواییم لێکرد و بڕۆ. شـەوە، رەنگـی زەوی سـپیە، هـی ئاسـمانێش نـازانم چـیه. زەوی تەخـت تەخـت نه بەرزایـیەک، نه چـاڵاییەک، هـیچ، بـێ گـرێیە. لـووس لـووس دەڵێـی قەوانـی بەیزافۆنە.

بڕۆ، خوایه به سەگێک بلێ، با بحەپێ، بەڵکو به ئـاوەدانی بـکەومەوە. بەڵکـو بـزانم به رێـی هەڵەدا هاتووم یان راست و راست. مـن دەنگـی سـەگی ئەو گونـدانه دەناسـمەوە. خـودا ئەوەی پێبەخشـیوم، له رێـی حەپیـنەوە گونـد بناسـمەوە. ئـاخر جـۆرە حەپینێکـــی نیـــوە شـــەوان هەیە، ســـەگ نـــاوی خـاوەنەکەی خـۆی، زۆر جـاریش نـاوی گونـدەکەی تێدا دەڵێتەوە. بەدبەختـی مـن سـەگ نەحەپی. بەڵام خواوڕاستان قەدی درەختێک هاته پێشم. ناسیمەوە بەو شەوە و له بن بەفران ناسیمەوە، شەکران بوو. لاوکبێژ گۆتبووی:

شەکران تاقە داری بەهەشتییە لە سەر زەوی. شەیتان هێندە ئیشە باشەی کرد، دەگەڵ خۆی هێنای و دوور لە چاوان لێرەی رواند.

هەر لەو ساتەش بووە سەگەوەڕ. تێگەیشتم زۆر لای چەپم گرتووە، تەواوێک رێم لە خۆم دوورخستۆتەوە. گەڕامەوە و هاتمەوە سەر رێی لاوکەکە.

پێناچێ شەو هێندەی مابێ، گەیشتم. دوو سێ سەگ بەخێرهاتنیان کردم. بەڵام پێدەچوو بەفر پێی بەستبن، بۆیە پەلاماریان نەدام. دەنگێک دەنگی دام و فەرمووی کرد. کاتێ تێگەیشت لە دوای کێ دەگەڕێم، گوتی:

سەر لە ئێوارە سەری خۆی هەڵگرت، ئاغا دارکاریەکی باشی کرد.

ناوی دوو گوندیشی هێنا کە هەر دەبێت رووی لە یەک لەوانە کردبێت. دوو نانم لە لوول دا و رۆیشتم. رۆژ لە ناو بەفر و تەڕوتووشی بۆتەوە، گەیشتم. هێی، دنیا، هەزار حەیف و مەخابن، بە دارەبازەشی رانەگەیشتم. لام نەدایە گوند. یەکسەر رێی گۆڕستانم گرت. دوا خاکەناسە خۆڵیان بە

سەردا کردبوو. لە بن کرێوە گۆڕەکەیان دەپەستایەوە. شێتۆکەک حوسکەیان دەگۆتی، بە پێیە پانەکانی گۆڕی دەپەستایەوە و بە دەنگە گڕەکەی دەیگوت:

تە قوونی تەشم وەکر، لاوکبێژ.

لاوکبێژەکەم لەو دیوەی دێری لە بن خۆل و لە بن بەفر بەجێهێشت. منیش بەسەر بەفر و بن بەفردا گەڕامەوە شار.

گۆتمە ئەبوو نەجم:

وایە، منیش بیستوومە ئاغایەک لە لاوکەکی ئەو لاوکبێژە بەژن و بالا و چاو و برۆ و سینگ و مەمک و سمت و رانی ژنی خۆی دیتیتەوە، بۆیە دارکاریەکی وەهای کرد، لە شەوێک پتر نەژی.

ئەبوو نەجم دەڵێ:

بەلام پیری پەنهانزان شتێکی دی گۆت، کوشتنی وی پەیوەندی بە ژن و ئەو شتانەوە نیە.

## ٨

پۆلیس چەشنی چاویەشە دەگەڕان. لە شار و گوندان دەگەڕان. بە دوای (مەلیکۆ)دا دەگەڕان. لە هەر چاخانەیەک، جێیەک شکیان کردبا، مەلیکۆ هەیە، دەچوون. چەند کەسیان راسپاردبوو، مەلیکۆ بکڕنەوە و بە پۆلیسی بفرۆشنەوە. پۆلیس بە دینارێکی دەکڕیەوە. دینار هەینێ خانووێکی قیتدەکردەوە. پارە دینبەرە، کەم کەس خۆی لە بەر ئەو دینارە رادەگرت. هەبوو بازرگانی بە قەوانی مەلیکۆوە دەکرد. هەرزانتر دەیکڕی و دەیفرۆشتەوە. ئەوانە بە بازرگانیی مەلیکۆ ناویان لە وڵات بڵاوبۆوە، لە بازرگانی شەکر و چا، لە بازرگانی تووتن، پتر ناسران و قازانجیان کرد. دەڵێن کەسێک لە ناو خێزانی لاوکبێژەکەشەوە دەستی لەگەڵ پۆلیس تێکەڵ کرد، بازرگانی بە لاوکەوە دەکرد.

ویستم شتێک لە بارەی ئەو لاوکەوە بڵێم، بەڵام ئەبوو نەجمیش دیار بوو دەردەکەی ئەوی گرتبوو،

بـواری قسـەی نەدا و لە زاری پیـری پەنهـانزانەوە درێژەی دایێ:

خەڵـک زوو، بەڵام حـوکمەت درەنـگ تێگەیشـت مەلیکۆ دژ بە خۆیەتی. مەلیکۆ هێرەی بە مەلیک و حوکمەت کردووە و نەیهێشتووە. حوکمەتی هەینێ هێـڕ بـوو. وەکـی هـی هەوکە نەبـوو، زوو لە لاوک تێبگـــــات. زوو قەوان و نەواران بخــــــوێنێتەوە. حوکمەتی هەینێ، منداڵ بوو، تەواو فامی نەکردبوو، درەنگ تێگەیشت و بە خۆکەوت و قەوانی پێچایەوە. بەڵام بە شـــێوەیەکی ژیـــرانە پێچـــایەوە. وەک حوکمەتی ئێستای نەکرد، بە زەبروزەنگ و کوشتن و بــڕین. نـــا، پـــارەی هەڵڕشـــت و کەم کەســیش هەستیپێکرد. پۆلیس ئەگەر راستەوخۆش قەوانەکەی کڕیبا، وای نیشـاندەدا، لە خۆشەویستی قەوانەکەیە، نەک دەست بە سەرداگرتنی. هەر بۆیە بە ماوەیەکی کەم مەلیکۆ بنبڕ بـوو. لە هـیچ مـاڵ و چاخـانەیەک کەس مەلیکـۆی نەبیســتەوە. حــوکمەت لەوەوە لە لاوکبێـژ بە رقـدا چـوو، بـۆی لە نـاو نـانێکی گەرم هەڵگرت.

ویســتم لە پیــری لاوکــی ئێــوە بپرســم، کەواتە مەلیکۆ سـەری لاوکبێژەکەی خـوارد؟ پرسـیارەکەم

گێڕایەوە، چوونکە زانیم بە پرسیار وەڵامی چ پرسیارێک ناداتەوە. بەڵام باش بوو لەو شەوە رێک هاتە سەر وەڵامی پرسیارەکەی سەر زاری من و گوتی:

حوکمەت دەستی دەگەیشتە لاوکبێژ و بە ئاسانی دەیتوانی بیکوژێ. بەڵام ئەوەی نەکرد. نازانم بۆچی، رەنگە نەیویستبێ بە دەستی خۆی بێت و لە سەر خۆی ساغ بێتەوە. ئاخر خاوەن مەلیکۆ لە وڵات ناسرابوو. لە کن گەورە و گچکە خۆشەویست بوو. هەبوو سوێندی بە سەری دەخوارد. هەبوو منداڵی بە ناوی وی دەکرد. چ ناو کاوێژێک نابینیەوە جگە لەو، بە ناوی کەسێکیترەوە کرابێت. لە دەنگیش جگە لە دەنگە داودیەکە چ دەنگێ نەیدەگەیشتێ. مەلیک بە مەلیکایەتی خۆی کە نە چیایی بوو، نە زمانی وی زانیوە، بە دیار قەوانی ئەوەوە دانیشتووە.

بۆیە حوکمەت رووی لە ئاغایان نا، ئاغایەکی بن شار هاتە بن بار، گوتبوویە حوکمەت:

ئەوە بۆمن لێگەڕێ، شتێکی وای بۆ هەڵدەبەستم، لە بەر چاوی خەڵک سووک و چرووک بێت. وا دەکەم خەڵک بێنە دیوەخان و بڵێن:

ئاغا، بیکوژە، ئەو سەگە بتۆپێنە، چۆن دەبێ...؟

ئەوە بوو بە ولاتدا بڵاوبۆوە، لاوکبێژ بچێتە هەر گونـــدێ، لاقەی یەک دوو ژن دەکـــات و لە فـــڵان لاوکیش بە سەر ژنی فلان کەسیدا هەڵگۆتووە و...

دیسان خۆم پێنەگیرا و گۆتمە ئەبوو نەجم:

کەواتە، بە هـۆی لاوکـی مەلیکـۆوە، حـوکمەت بە دەستی ئاغایەک کوشتی؟

ئەبوو نەجم دەڵێ:

منیش وا تێگەیشتم، بەڵام پیری پەنهانزان وا ناڵێ. کوشتنی لاوکبێژ بە هۆی لاوکێکەوە بوو، نەگەیشتە سەر قەوان، گۆتی:

ساڵی، توخوا ساڵی چەند بوو؟ وا تێبگەم هەر ئەو ساڵە بوو کە کوڕە ئاڵا هاتە دنیایێ. دەمەو ئێوارەیەک لە کن ئاوی میری دەورمان دابوو. باسی دەنـــگە داودیەکەی دەکـــرد. خـــۆزگەی دەخواســـت دەنگی وەک دەنگی وی با. هەر ناویشی نابوو داود، دەیگوت:

لە دوای حەزرەتی داودەوە یەک داودی دی هاتە دنیایێ. ئەویش ئەوەتا لە سەر قەلاتێ، بەلام حەیف لاوکان نالێ.

ئەمن بە شەرمەوە داوای لاوکەکەم لێکرد، بە رێزەوە، بە لالەپتیەوە گوتی:

ببۆ بۆ بۆ تتت تۆی نە نە نەلێم بۆ کککککێی دەدەدەلللێم

دەستێ خستە بن گوێی و تێیهەلکرد. هیچ کام لەو لاوکانە نەبوو کە کەوتبوونە سەر قەوان. ئەو لاوکانەش نەبوو کە پێشتر گوترابوون و بیسترابوون. لاوکێک بوو باسی داگیرکاریی عارەب و رۆم و عەجەمی دەکرد، باسی تاوانکاریی ئینگلیز و رووسی دەکرد، باسی خۆخۆریی کوردی دەکرد.

دوا داود لە مزگەفتێوە ئەو لاوکەی بیستبوو. بیستمەوە ئەو ئێوارەیە زۆر گریابوو. شار زوو بەو گریانەی داودی زانی، چوونکێ بە گریانەوە بانگی شێوانی دا. پاشتر گوتبووی:

من دەبێت خۆم فێری لاوکچڕین بکەم.

پیری پەنهانزان لە وەسپکردنی ئەو لاوکە، زمانی تێکدەئاڵا و قسەی بۆ نەدەهات. دیتم گریا، یەکەمین جارە گریانی وی ببینم. بە دەنگ گریا، فرمێسکی هۆن هۆن هاتنە خوارێ. ئەبوو عەلا خۆی پێنەگیرا و خۆی لێ توورە کرد، دەستی بەرزکردەوە، زللەی لێدا. لەو ساتە دیتم دڵۆپە فرمێسکەکانی سەر روومەتی بوونە ئەستێرە و پیری پەنهانزان لە ناو ئەستێران بزربوو. چاوم نووقاند و پشتم تێکرد. کاتێ ئاوڕمدایەوە، ئەبوو عەلا لەوێ نەمابوو. پیری پەنهانزانیش بە قوونەوە لە ناو تیشکان خەوەنووتکەی دەبردەوە. بە دەم خەوەوە قسەی لە لاوکەکە دەکرد:

قسە گەیشتبۆوە بەغدا کە لاوکێک بەرێوەیە، ئەگەر بگاتە بەیزافۆن و بکەوێتە سەر قەوان، هەرایەکی گەورە دەنێتەوە. هەرایەک چ بزاڤ و شۆڕشێک نەینابێتەوە. حوکمەت بە خۆکەوت و دەستوبردی لێکرد.

## ٩

+ ئەبوو نەجم، تۆ باوەڕتهات، پیری پەنهانزان دڵی دەتریوێنێ و پێش قەومان بە قەومان دەزانێ؟

– نا، ئێمە پێمانوابوو کەسێک هەیە، هەواڵی دەداتێ. بە تایبەتیش لەو پیاوەی ئەو پێیدەگوت پیاوی ناو ئایەتان، بەڵام ئەبوو عەلا لە کۆتایی بەو باوەڕە گەیشت.

+ تۆ، بە چاوی خۆت دەتدیت ئەستێرە بۆی دێتە خوارێ و دەیپارێزێ، کەچی باوەڕ بەوە ناهێنی ئەو پیاوە پەڕجوودار بێت؟

– ڕاستی جاروبار ئەو خەیاڵەم دەکرد، بەڵام زوو دەهاتمەوە سەرخۆ. من کەسێک بووم باوەڕم بەو دنیا و هێزی نادیار و ئەودیوی سرووشت نەبوو. دەمزانی هاتنی ئەستێرە و بزربوونی پیری پەنهانزانی ئێوە پەیوەندی بە ناسیاری و دراوسێتیەوە هەیە. ئاخر من پێش ئەو تووشبوونە، هەرگیز لەگەڵ دراوسێی خۆم شتی خراپم

نەکـــردووە. زانیبـــام دژی ســـەرۆکیش درووشـــم دەکێشــێ، چاوپۆشـیم لێـدەکرد. بەڵام ئەوەی پیـری پەنهانزان هی چاوپۆشین نەبوو. چۆن بەوەی زانی؟ ئەگەر کەسـێک پێینەگوتبێـت، نابێـت. کـاری وا لە دەستی پەرجووش نایەت، بۆیە ناچار مام بیخەمە زیندانێ.

بەڵام لە چاوپڕا دیارە، لە دڵەوە وا نالێ. پێدەچێ ئەویـش بە شـێوەیەک بـاوەڕی بە هێـزە نادیـارەکە هەبـێ، دوورنـیە ئەویـش گەیشـتبێتە ئەو بـاوەڕەی پیـــری پەنهـــانزان دڵـــی دەتریـــوێنێ و لە دنیـــای نادیـارەوە هەواڵــی ســەر دنیـای بـۆ بێـت و پـێش رووداو، رووداوەکە ببینێت.

ئەبوو نەجم نیو پێکێکی کردە فڕێک. پەنجەی برد سـمێڵی بـادات، لەبیریچـوو تراشـیویەتی. بە سـەر خۆی ناهێنێ و نـایگەڕێنێتەوە. دەیگەیەنێتە بـرۆی و چەند تـاڵێکی دەگرێت و دەیکاتە کشتەک. پێشترێ، ئەو دەمەی مـاڵی کەوتبـووە نێـوان مـاڵی پیـری پەنهانزان و ئێمە و مامۆستای قوتابخانەی گەڕەکێ بـوو. وانەی ئـایینی دەگـوتەوە. هەینـێش سـەری سـمێڵی وا لێـدەکرد و لە شـێوەی کلـکە مشـک دەیهێنشـــتەوە و زۆر جوانیشـــی لێـــدەهات. قـــلە

زەیتوونێک دەخاتە زاریەوە و ناوکەکەی بە سەری پەنجە تێهەڵدەدات. پاش کەمێک هەردەستێت و دەگەڕێ. ناوکەکەی دەبینێتەوە و دەیهێنێت دەیخاتە ناو تەپڵەی جغارەوە و پەشیمانیی پێوە دیارە:

خۆزگەم بە سالانی پێش هێشتنەوەی سمێڵ. نە زللەیەکم وەشاندبوو، نە زمانم لە کەسێک دابوو، نە دەستم لەگەڵ هیچ دامودەزگایەگ تێکەڵ کردبوو.

وردتر چاو دەبڕمە سیمای ئەبوو نەجم، سمێڵداری نیە لە دنیایێ بە تراشینی سمێڵی وەک ئەو پیاوە هێندە سیمای بگۆڕێ و کەس نەیناسێتەوە. من تا ناسیمەوە زۆری برد. تا وێنەی پێش هێشتنەوەی سمێڵیشی نیشاننەدام، باوەڕم نەهات، ئەو پیاوەی وا لە هۆدەیەکی ماڵێکی لاچەپ سەربردەی پیری پەنهانزانم بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو پیاوە بێت کە دوو کلکە مشکی ناسکی بە لالێوە قیتببوونەوە. کەس نایناسێتەوە، ئەو کوڕەش کەوا لە مێزێ لەگەڵمانە نایناسێتەوە. ئەو کوڕەی لە زیندانێ چەند جارێ بە سمێڵە کلکە مشکیەکانیەوە دیتوویەتی و ئێستاش جێ قامچیی دەستی وی بە سەر پشتیەوە دیارە. ئەویش نایناسێتەوە، ئەبوو نەجم خۆیشی دەڵێ:

کـاتێ تەماشـای هەر سـێ وێـنەی خـۆم دەکەم، وێـنەی بەر لە سـمێڵ، وێـنەی سـمێڵ، وێـنەی دوای سـمێڵ، چەنـدی لێـوردەبمەوە وێـنەی ناوەنـدێ ناناسمەوە.

ئەبوو نەجم وێدەچێ لە جاران مەستتر بووبێت، چـاو لە سـاپیتە دەبڕێـت. بە دەنگێـک هەر ئەوەتە دەیبیستم:

بە کەرتە مووسێک گەڕامەوە سـەر سیمای پێش ناسـینی ئەبـوو عەلا، بەڵام بە چـی دەبـمەوە مرۆڤەکەی پێش ناسینی وی؟

دەنـکە زەیتوونێـک دەخـاتە زاریەوە و دیسـان نـاوکەکەی فڕێـداتە بـن پەنـجەرەکە، دیسـانەوە هەڵیدەگرێتەوە و دەیخاتەوە ناو تەپڵەی جغـارەکە و جغارەیەک دادەگیرسێنێ. لێیدەپرسم:

+لە گەمەی ئەو فڕێدان و هەڵگرتنەوەیە تێناگەم، پیری پەنهانزان شتی وای دەکرد؟

-نا، ئەوە کێشەی جاران و ئێستایە، مرۆڤ کاتێ هەڵەیەک دەکـات، ئەگەر وەکـات راسـتی نەکـردەوە، دواتـر راسـتنابێتەوە. فڕێدانی دەنـکە زەیتوونێک بـۆ جێیەکی وا هەڵەی ئێستایە.

+ لات وایە، ئەوانەی تۆ کردوونت، هەڵەن، تـاوان نین؟!

– مـن باسـی هەڵەم کـرد نەک تـاوان، تـاوان نە گونـاحە، نە هەڵە تـا رەشـبىبێتەوە. مـن لە هەڵەوە دەسـتمپێکرد، دەسـتبەجێ راسـتمنەکردنەوە، بە گوناحـدا پەڕیمەوە و گەیشـتمە تـاوان. لەوە گەڕێ، ئێـوە بە دوای نەوارەکانـدا بگەڕێـن، تـا پیـری پەنهـانزان چـۆن بـووە وا بیناسـن. مـن چەنـدی بیگێڕمەوە، ناتوانم بیناسێنم، ئاخر...

قسـەکەی تەواوناکـات و دەچێتە سـەر پێشـاوێ. زیندانیە کۆنەکە دەڵێ:

+ بە قسەی من دەکەیت، با ئەو قسانەی بگەیەنینە ئاسایش.

– نە، پێشـترێ چەنـدیان لێدەرهێنا، ئێسـتاش هەر هێنـدە، دووریـش نـیە بە دەردی پەڕەکـاخەز و نەوارەکان بچێ.

زیندانیی کۆن سەری رەزامەندی دەلەقێنێ.

ئەبوو نەجم دێتەوە و دەڵێ:

با ئەوجارە بەس بێ، خەوم دێ، سبەی بە بیرمبهێنەوە، دەچینە کن دوا داود..

پێدەچێ لاسایی پیری پەنهانزان بکاتەوە. دەچێتە سەر جێگاکەی و خولەکێکی نەبرد، پرخاندی، زیندانیە کۆنەکە گوتی:

سەربردەی پیری پەنهانزان دەستی بەستووم، دەنا ئێستا بە پێلەقە بە سەری دەکەوتم و دەمناردە دۆزەخ.

گوتم:

باشنیە، بیر لە شتی وا بکەیتەوە، هەر کەسێ لە ساتی مەستی، توندوتیژیی بە مێشکدا هات، نەخۆشە.

## ١٠

داودی یەکەم لە سەرەمەرگێ بوو. ئەودەمەی فریشتەی خودا چۆکی لە سەر سینگی دابوو، لێپرسی:

لە سەر راسپاردەی خودا هاتووم تا دوا قسە و مرازی سەر دنیات ببیستم.

داود گۆتی:

بڵێ بە خودا، لە دوای من حەفت داود بێنێتە دنیا، هەر یەکە لە سەردەمێک و شتێکی منی تێدا بێت.

خودا بە قسەی کرد، داودە دەنگیەکەی بەخشیە ئەو قەلاتەی ئێمە.

+ باشە، تۆ ئەو قسانە لە کوێ دەهێنیت؟

پیری پەنهانزان هەرگیز یەکسەر وەلامی پرسیارانی نەدەدایەوە، بەلام نازانم چۆن بوو گوتی:

– خەون، لە خەونێ، خودای ناو خەونێ.

+ قسەی حیزی ناو خەونێ بۆ ئێمە دەگێڕیتەوە؟!

وەک لەگەڵ ئەویشمان نەبێ، وابوو. درێژەی دایێ و بە درۆداو گێڕایەوە:

دوا داود ناوی لەگەڵ با رۆیشتبوو. شاران و چیا و دەریای بڕی بوو. لە ئێران و توووران و عارەبستانەوە دەهاتن، گوێیان لە مەقام و بانگ و سەلای وی دەگرت. لە وڵاتی فیرعەونانەوە بە دوایدا هاتن، گۆتیان:

لەگەڵمان وەرە، بچینە ناو ئەهرامان. کلیلی دەرگەی گەنجینەی قارۆونت وەگیردەکەوێت. دەنگت وەک نیل نەمر دەبێت. حەیفە وا بە قەلەندەری لە حەوشەی مزگەفتێ کەوتووی.

دوا داود نەچوو. ئەو قەڵاتە کە سەردەمانەک دیوەخانی خوداوەندان بوو، هەر کەسێ سێ شەو تێیدا مابێتەوە دەستبەرداری نابێ. هەر خوداوەندە دەستێکی دەگرێ، پێیەکی دەگرێ. ئەگەر لە دەستی سێیانیش خۆی راپسکێنێ، لە دەستی خوداوەندی چوارەم دەرناچێ. ئەو خوداوەندە لە هەر وەرزێ بە شتێ کەمەندکێشت دەکات، ناهێڵێ دوورکەویتەوە. پایزان بە پەلکی داران، بە چاوی خۆتان دەبینن،

قەدی قەڵاتــێ پەلکــی زێڕینــی دار دەگــرێ، بــا رادەسـپێرێ سـەمای بازنەییـان پێبکـات. چـاودەنە سـەمای پـایزانەی پەلکـی داری دەوری قەڵاتـێ، کـێ دڵی دێ پشتی تێبکات و رووی لێوەرگێڕێ؟

زستانان دەوری قەڵاتێ پڕدەکات لە نمەی بارانێ. هەر نمەیەک دەبێتە وردە مینـایەک. دنیا سـامـاڵ بێ یان هەور و لێڵ، شەو بێ یان رۆژ، وردە مینا، مینـا برووسـکـەی هەورێ تیشــک دەدەنەوە. تیشــک لە ئێکدی وەردەگرن لە دوورەوە گەرمـایی دەبەخشـن. رێبواری ناو هیشکە سەرمایێ رادەکێشن.

خوداوەنــدێ چـــارێ، لە کەژی بەهـــارێ قەڵات دەکـاتە قەزمەی بـووکێ، قەزمەی پـڕ کـۆترۆکە. بە خەزێــمە و حــاجیلە دەینەخشــێنێ. لە پەنــجەرە بڵندەکانیشەوە ئاوی رێحـانەی تێکەڵ بە شـنەبای لە شابسـک و کەزیـانەوە هـاتوو، پێدا دەپژێنـێ. بـۆنی بەهـــاری قەڵاتــێ دەمـــار دەڕوا. بـــۆنێکی جـــــادوویی، رێبـــــوار لەوبەری هەردوو زێ دەگێڕێتەوە.

خوداوەندێ چارێ، خوداوەندێ مەزنێ قەڵاتـێ، لە شەوی هاوینان، لە ئاسمانی قەڵاتێ لە سـەر جۆلانە دادەنیشێ. بایێ شەماڵ رایدەژەنێ، راژەنینێ لە هەر

بڵندبوونەوەیەکدا دەگاتەوە زێ. خوداوەند لە سەر جۆلانە تەزبێحات بە ئەستێرە دەکات. ئەستێرەکان دەنگە تەزبێحی دەستی خوداوەند، کێ هەیە حەز نەکات بە دیار قل قل ئاودیوکردن و گەڕانەوەی ئەستێرەوە دانەنیشێت.

شار جادووی لە هەمووان کردووە. منداڵەکانی خۆی داکۆنی کردووە. دوو شەو لێی دوورکەونەوە، خەونی پێوە دەبینن، بۆی دەگرین، قوڕی بۆ دەپێون. هەر بۆیە دوا داود نەچوو، نەچووە وڵاتی نیل و دەنگی نەگەیشتە دنیا. لێرە خستیە بن خشتی مزگەفتێ.

گۆتمە ئەبوو نەجم:

تۆش وەک پیری پەنهانزان سەربردان درێژدەکەیتەوە، وا بڕوا، بە سەت شەویدیش ناگەینە پیاوی ناو ئایەتان.

مژێک جغارە و فڕێک عەرەقی بەسەردا کرد و گوتی:

دەزانی من هەر لاپەڕەیەکی ئەوم کردۆتە دێرێک. جغارەخۆرێکی ئەوم کردۆتە مژێک. تا نەوارەکان نەبینیەوە، باوەڕناهێنیت. باوەڕت بێت

تەنهـا ئەو کەمە سـەرهاتەی پەیوەنـدی بە دەنگـی داودەوە هەبوو، من هێشتا بۆ تۆم باس نەکردووە، پیـری پەنهـانزان شـەوێکی پێکوشـت. هـا، تـا پێکێک چیدەکەیت بۆت دەگێڕمەوە:

پیـری پەنهـانزان، پـاش ( هێـی دنیـا، داخـی گـرانم، پەکوو پەکوو) گوتی:

خەوتبـووم، بە دەنگێـک بەئاگاهـاتم. دەبینـم حەزرەتی داودە، لە خەونێک دیتبووم، ناسیمەوە، لە سەر سەرم راوەستاوە و گوتی:

زوو نەگەیتـیێ دەنگـم ئاوەوئـاو دەچـێ و کەس نامبیستێتەوە و لە دەستی دنیا دەچم. یەکپێ چـووم، زانـیم مەبەسـتی دوا داودە. کەمێـک پێشـتریش دڵـم تریوانـدبووی، خەونیشـم پێیەوە دیتبوو، لە نـاو ئەو کەرتـکە ئـاوێنەی ردێـنم بە دیـاریەوە دەتراشـم وێنەیەکی دەنگدار و جوولەدار بە پێشـمدا تێپەڕی. ئەو بوو، داود بوو کە لە ترسی دنیا نـاوی لە خۆی نـابوو شـەهابە. کەوتبـووە دوای لاوکبێـژەکە بە گۆرانی دەیگوت:

راوەستە، دێمە ئەوێ، لە دنیا جێم نابێتەوە.

تا ئەوم هێنایە رایێ و بەیزافۆنم ئاگادارکردەوە، نەیارانی دەنگ دەرمان خواردیان کرد. لە جێ کەوت و دەنگی کەوت و گەیشتە لاوکبێژەکە. هەر دەنگ نا، گۆڕیشی لە پاش بەجێنەما. ئەنگۆ لەبیرتان نیە، داودی ناو گۆڕیش، لە گۆرانی نەکەوت. زۆر کەس بە لای گۆڕەکەیدا تێپەڕیون و گوێیان لە دەنگی بووە، ترساون و هەڵاتوون. شارەوانی گەیشتێ و گۆڕی داودیان شوونبزر کرد.

بە دەم باوێشکەوە گوتم:

من درەنگمە، زوو وەرە سەر سەربردەی پیاوی ناو ئایەتان.

ئەبوو نەجم باوێشکی لە باوێشک گرێدایەوە:

منیش کاتێ بە دیار پیری پەنهانزانەوە دادەنیشتم لە تۆ پەلەتر بووم، هەوکەش دەمەوێ زوو سەربردەی ئەوم لە مل بێتەوە، لێ خەوم دێ، هەڵیگرە بۆ شەوێکیدی.

## ١١

به ڕۆژ لەو ئاقـــارە بە دوای گـــۆڕدا دەگەڕێـــم، گۆڕی ژنەکەم. بەشەویش گوێ لە سەربردەی پیری پەنهانزان دەگرم. ئیدی ئەو ماوە ژیان لەگەڵ ئەبوو نەجمـــی گـــۆڕدن، ئەبـــوو نەجمـــی هەقـــایەتخوان بە ســـەردەبەم. بە ڕۆژ زۆر رقـــم لێیەتـــی، زۆر جـــار دێتەســـەرم ســـەری هەڵکێشـــم. بەڵام شـــەوان نـــا، کتێبـــێکە بە مـــن بێـــت ســـەری لەســـەر هەڵنەگـــرم. کتێبێکی ســـەیرە، شـــەو هەیە حەزدەکەم زوو بگەمە دوا لاپەڕە و ئیـــدی بـــیخەمە قـــوژبنێکەوە. شـــەویش هەیە بە مـــــن بێـــــت بنـــــی نەیە، درێـــــژبێتەوە، لە هەزارویەک شـــەوە درێژتـــر، لە تەمەنـــی دیکتـــاتۆر درێژتر. ئەبوو نەجم بۆ من پیاوێکە لەو چەشنە.

+ بە من بڵێ، مەبەستتان لە دزینی تەرمەکە چی بوو؟

– تـۆ، دەڵێی شـت لەبیردەکەیت! وەک گـوتم بـۆ بزرکردنی شوێنەواری پیری پەنهانزان.

+ خەونەکەی ئەبوو عەلا دەڵێی؟

– ئـا، ئەوە نەبـوو؟ ئەو شـەوەی دەبـوو بیـبەنە گۆڕسـتان، ئەبـوو عەلا لە سەرخەوشـکاندنێک، دوو ئەسـتێرەی دیتبـوو. هـاتبوونە سـەر گـۆڕەکەی و خەڵک دەوریان دابوو.

وایە، ئەبوو نەجم چەندان جار سـەرهاتی دزینی تەرمەکەی بۆم گێڕاوەتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی خۆم کەسـێکی گومانـاویم و ئەو پیـاوەش سـەردەمێک قامچیوەشێن بووە و گۆڕی ژنەکەشمی دزیوە، بە ئاسـانی باوەڕنـاهێنم. جـگە لەوەش شـتی تـازەم بیردەچێتەوە. لە ناو کۆمەڵێ حووشترالووک شانی ئەبوو نەجم رادەتەکێنم و دەپرسم:

+ دەزانی ئەو گیادڕکە ناوی چیە؟

– نا...

+ حووشترالووک واتە ئالیکی حووشتر.

پێکەنی و گوتی:

– کەواتە ئێوەش پێشتر حووشترتان هەبووە.

+ نەخێر، بەڵام ئالیکی حووشترمان هەبووە، هەر کاتێ حووشتر لەو بیابانە لێی قەومابێت و پەنای بۆ ئێرە هێنابێت، نەمانهێشتووە بە برسێتی بمێنێتەوە.

- بەڵام وەک مـــن تێگەیشـــتبم، حووشـــتر لە لێقەوماندا هەرگیز پەنـای بۆ ئێرە نەهێنـاوە. کۆچی حووشتر لە هێزەوە بووە، دەزانی خۆش نیە تۆ مـن بە حووشـــتر بچـووێنی، یـان حووشـــتر بە مـــن بچـووێنێ، تـۆ رازی مـن بە هێسـترت بچـووێنم؟! ئـاژەڵی بە سـتەزمان بۆچی دەکەیـتە هێمـای منێکـی قامچیوەشێنی گۆڕدز؟

هەستدەکەم، گێلانە بە نـاوکەوتووم، بەڵام بەسـەر خۆم ناهێنم. توندتر شانی رادەتەکێنم و دەپرسم:

تـــۆ چـــۆن تەرمـــی ژنەکەی منـــت لە هـــی ئەو جیانەکردەوە؟

سەر بادەدا و دەڵێ:

بەو شـــەوە لە نـــاو کفنـــێ بە چـــی لێکیـــان جودابکەمەوە؟

نابێـت نەیبیـنمەوە، حەفـت سـاڵە لە چـاوەڕێی هـاتنەوەی ژنەکەمـم. ئـای ئەبوو نەچـم ئەگەر لێت خۆش بم، گوناهم دەکـاتێ. ئەگەر دۆزەخێک هەبێت خـودا بـۆ گوناهکـارانی هەڵکردبێـت، لە سـەر ئەو لێخۆشـبوونە پیلم دەگرێت و هەڵمـدەداتە نـاویەوە. مەگەر ژنەکەم دەنـا کەس بە دەنـگ و هـاوارمەوە

نـایێ، ئەبـوو نەجـم خـوات بە قوربـانی سـەربردەی پیری پەنهانزان بکات، دەنا دەمزانی دەتنێرمە کوێ.

+ گۆڕەکەتان بە شۆفەڵ لێدا؟!

– وەک گـوتم، شـۆفەڵەکە چەنـد دەوێـک زەوی هەڵقەند و هەڵماندایە نـاوی و زەویەکەمـان تەخت و لووس کردەوە. چەند ڕۆژێکیش پاسـەوانمان لەوێ دانـا، نەوەک کەسـێک، شـوانێک جێـیەکە ببینـێ و گومانی شتێ بکات.

ئەبوو نەجم دەڵێ:

درەنگ داهات، نەچینەوە؟!

وایە، ڕۆژ لە سەر ئـاوابوونە، تـا دەگەینەوە سـەر جـــادە، تاریـــک دادێ، ئەســـتێرە هەڵـــدێ. نەگەیشتووینەتەوە کن ترۆمبێل، هەستدەکەم ئەبوو نەجم خـۆی دوادەخـات، وەک بڵێـی نیـازی شـتێکی هەبێت، نـازانم بـۆچی ئەو بیـرەم بە مێشـکدا دێـت، ئـــاخر ئەو پیـــاوە وەک تێیـــبگەم ئەوەی بیـــری لێنەکاتەوە ئەوەیە.

منـــیش پـــژدێنەکەم تونـــددەکەمەوە و جێـــی دەمـانچەکەم دەگـۆڕم، بەوە ویستم بەبیریبهێنمەوە،

دەمـــانچەم لایە. کەمێکیتـــر دەڕۆیـــن. لە ڕۆیشـــتن وەستا. دەبینم هەردوو دەستی کەمێک بەرزکردەوە، ڕۆژ ئـــاوابووە دەموچـــاوی جـــوان دیـــار نـــیە، بەڵام هەســـتدەکەم لەبەر خـــۆیەوە شـــتێک دەخـــوێنێ، تێناگەم:

چیە، چیتە؟

پرسیارەکەم چەندبارە دەکەمەوە، وەرامناداتەوە. توند شـانی رادەتەکێنم، رادەچڵەکێت و بە دەنگێک هەر ئەوەتا دەبیستم:

- هات، گەیشت، نیشت...

+ چ نیشت؟ تۆ تێکچووی!

رووە و جـــــادە رادەکـــــات، دەکەومە دووی، دەوەســـتێ و ئـــاوڕدەداتەوە، بە دەنگێکـــی کەمێـــک بەرزتر:

ئەها، دوو چاو، لە چاوی پیری پەنهانزان دەچن، گەیشـــتن. نـــا، چـــاو نـــین، دوو ئەســـتێرەن، نیشـــتن، ئەوەتان، لە پشتتن، ئاوڕدەوە، چۆن هەڵدەپەڕن...

هێنـــدەی نەمـــابوو، بـــاوەڕبکەم، ئاوڕمـــدایەوە. نە ئەستێرە هەیە و نە هیچ.

+ کابرا، تۆ شێت بووی؟ له چی ترساوی؟

- چۆن نایانبینی؟! جوان تەماشاکە، رووناکییان وەختە چاوم کوێر بکەن.

ئەبوو نەجم توند چاوی خۆی دەگرێت، خۆ هەڵدەداتە ناو ترومبێل. کۆنە زیندانی لە سەر سووکانەوە داوام لێدەکات کە سواربم و بەڕێبکەوین. لەو ساتە ئاوێنەیەکی خڕ لە شێوەی مانگ، نا، مانگ بوو لە شێوەی ئاوێنە وەک بڵێی لە ئاسمانەوە دابەزی. تەماشادەکەم، چاوی ژنەکەی خۆمم تێدا دیت. ئەوەتا لە پشتم راوەستاوە، ئەو ئێوارەیە هێندە و تەواو.



نا، هێندە و تەواو نا، کاتێ بە زۆر رامکێشایتە ناو ترومبێل. مانگە ئاوێنەکەت لەگەڵ خۆت هێنا. ئەبوو نەجمیش بە ئەستێرەوە، تۆ بە شێوەیەک دەستت راگرتبوو، بە شێوەیەک تەماشاتدەکرد و دەتدواند، من لەوە بوو باوەڕبهێنم. نا، باوەڕمهێنا، ئاوێنەیەکت لە دەستە و ژنەکەت لە ناویەتی و قسەی دەگەڵ دەکەیت. من زۆر جار لە سەر سووکانەوە سەرم لاردەکردەوە تا رووی ئاوێنەکەی دەستت ببینم.

بەڵام تـــۆ بە شـــێوەیەک راتگرتبـــوو، نەمـــدەدی. تەماشای نەینۆکەکەی سەرێم دەکرد، بەڵکو لەوێوە ببیینم، نەبوو، لەوێـوە ئەبـوو نەجـمە و کەوتـۆتە تاریکیەوە، تۆ بە دەنگی بەرز قسەت لەگەڵ دەکرد. پرسیاری رفاندنەکەت لێی دەکرد. پێدەچوو ئەویش وەڵامبداتەوە، بەڵام دەنگی نەدەگەیشتە گوێی من. تۆ لێت دەپرسی:

ئەو پیـاوە بـوو تـۆی دزی؟ دەی وازی لێبهێنە. تـۆبەی کـردووە. جێت سـەرەڕێ نەبـوو؟ بە سـەر زگت نەکەوتن؟ نەیانزانی، گەردنیان ئازادکە. بە من بڵێ ئەدی منداڵەکە؟ کێ بۆی هێنایەوە؟

لە نەینۆکەکەوە ئەبوو نەجمی ناو تاریکی پێدەچێ چـــاوی نووقانـــدبێت، بە شـــێوەیەک دەســـت رادەوەشێنێ وەک ئەوەی شتێک لە خۆی پاسبکات. ئەستێرەی پاسدەکرد. دەنگی ئەو نزم بوو، لە ناو دەنگی تۆ بزربووبوو. جاروبار وشەی ئەستێرەم دەبیست، یان کەرتێک لە وشەکە.

ئەو ئێوارەیە تا گەیشتینەوە ماڵێ، کەوتبوومە ناو شێتان. یەکیان بە ئاوێنە و ئەوی دی بە ئەستێرەی گرتبوو. ئەو ئێوارەیە، لە ئێوەوە شتێک لە شێتایەتیم گرتەوە. باوەڕمهێنا شێتایەتیش دەگوازرێتەوە. من

مـــانگەکەی دەســـتی تـــۆم دیـــت کە لە شـــێوەی ئـــاوێنەیەکی خـــڕ لە پـــێش خـــۆ راتگرتبـــوو. لە جامەکەشـــەوە دەمـــدیت ئەســـتێرە لە ئاســـمانەوە بەردەبـــوونەوە و لە پشـــتەوە لە ســـەر کوشـــێن لە تەنیشت ئەبوو نەجم دەنیشتنەوە.

ئەو ئێـوارەیە ئێسـتاش نـازانم چـۆن و بە کوێـدا گەیشـتینەوە شـار و مـاڵێ. خـۆ کـاتێ چەکـداری بازگەکە هاتە پێشێ و پرسی:

هیچت لە سندووقێ بارنەکردووە؟

بە دڵنیاییەوە گوتم:

بەڵێ، مانگێک و چەند ئەستێرەیەک.

پێدەچوو بە سەرخۆشم تێگەیشتبێ، بۆیە گێچەڵـی پێمنەکـرد و رێیـدام. ئیـدی چیـدی لەگەڵتـان نـایەمە ئاقارێ. بە قسەم دەکەیت، واز لەو گەڕانە بێنە، دەنا بە تەواوی بە ئاقار دەکەویت و لەدەستدەچیت.

+ تکـادەکەم، ئەو ئێـوارەیە لەبیـری خـۆت بـبەوە. ئەو ئێـــوارەیە تۆمـــان لەگەڵ نەبوویـــت، نەهیچـــت بیست، نە هیچت دیت.

– وا دەکەم.

## ١٢

مانگی ئاوێنەیی لە ئەبوو نەجمیش دەشێرمەوە و ناهێڵم بەو دابەزینە بزانێ. دەچمە دیار ئاوێنە خڕەکەی چاوەی خەوتن. ئەو ئاوێنەیەی پێش گواستنەوە، لە کاتی ماڵدانان ئەستێرە دەستی لە سەر دانا و کڕیمان. من بزمارەکەم کوتا و ئەو پێوەی کرد. کێشەی بڵند و نەوی داکوتانمان نەبوو، چوونکێ لە بەژن هەر دوو پەنجەیەک کورتی دەهێنا. کەم دێمە ئەو هۆدەیە. بۆ سڕینەوە و تۆز لێتەکاندن نەبێ سەری پێداناگرم. چاوم بەرایی نادات.

دوای ئەو ئێوارەیەی مانگ لە ئاقاری بۆم دابەزیبوو، کردبوومە ئاوێنە و لەگەڵ خۆم هێنابوومە ناو تڕومبێلێ. ئاوێنەکەی ماڵیش شێوەی مانگی گرتووە. لەو مانگەوە ئەستێرەکەی خۆم دەبینم. هەمیشە لە پشتمەوە رادەوستێ. دەست بە پرچی خاویدا دادەهێنێ و جاروبار چاوم لێدادەگرێ. ئاوڕدەدەمەوە، دەبێتە چۆلەکە و

هەڵـدەفڕێ. نـاگیرێ، ئەسـتێرە دزراوەکەم نـاگیرێ. ئـای ئەسـتێرەی دزراو لە چ شـەوێکی هەڵە مـردی. لەو شەوە نەبا لە گۆڕەکەی خۆت دەمایتەوە. منیش هەمـوو پێنجشـەمووان بە گوڵێـک، یـان گـوڵمێ قەنەفرەوە دەهـاتم. گوڵەکەم بە کێڵەکەتەوە دەکرد، قەنەفلێشـم بەلای سـەرتەوە دەخسـتە بـن خـۆڵ و چەند دڵۆپە فرمێسکێکم پێدا دەڕژاند و گۆڕستانم لە بۆنێـک دەگـرت مەگەر لە خەونەکە بـۆنی وا بەهەشـتی پـژا بێـت. خەونەکە وا بـوو، لە سـێیەم شەوی دواکۆچی خۆت و گۆڕەکەت، مـن خەونێکی وام دیت. لەو خەونە لە ئاسمانێ تۆم دیت. لە سـەر باڵی دوو حاجی لەقلەق راکشابووی. هـاتن هاتن، بە نەرمـی لە سـەر گۆڕە هەڵـدراوەکەت نیشـتنەوە. لە دەمـی خـۆڵ پێـداکردنێ، لە شـەقەی بـاڵی حـاجی لەقلەقان بەئاگاهاتمەوە.

دەتبیـنمەوە، ژنەکەم، دەتبیـنمەوە. ئەو دەشـت و دەرەم هەمووی بە نینـۆک هەڵکەندبێت، دەتبینمەوە. دەتناسـمەوە، بە پـرچ دەتناسـمەوە. بە هێسـکی چەنەگە و پـاژنەی پێـت دەتناسـمەوە. لە هـی کەس نەدەچـوون. ئەگەر لە پەنجەیـان نەکـردبیەوە، بە ئەنگوسـتیلەکەت دەتناسـمەوە. خـۆ هەرێـم لە

تەرمشۆر وەرگرت، لە پەنجەت نەکاتەوە. سوێندم دا لێینەکاتەوە. سوێندیخوارد هەر بە پەنجەتەوەیە.

+ تۆ بە من بڵێ، کاتێ بردتتان ئەنگوستیلەکەی بە پەنجەوە بوو؟!

- ئەگەر لە پەنجەی بوبێت، پێیەوە ماوە.

+ لە پەنجەی بوو، چۆن تۆ نەتبینی؟!

- سەربردەی هەڵدانەوەی گۆڕەکە و بردنی تەرمەکە بەو شێوەیە بوو کە بۆم گێڕایەوە. وا دیارە هێشتا... تۆ پێویستە خۆت کۆبکەیتەوە. لە خەون و خەیاڵ وەرە دەرێ. وا بڕوات،ساڵێک قسە بکەین، شارێک نەوار پڕبکەیتەوە، ناگەینە هیچ. قسە بەلارێدا دەڕوات. دەیڵێمەوە: ئەو بڕە تەمەنەی ماومە بۆ دیتنەوەی گۆڕە تەختەکەی ژنەکەی تۆی تەرخاندەکەم، بەڵام حەیف، کەسێک نیە سۆراخێکی پیری پەنهانزان و نەوارەکان بکات.

تۆ راست دەڵێیت، من لە داخی ئەستێرەی دزرام زۆر پەرتم. مەگەر بە ئاگر خۆم خڕبکەمەوە. تۆ راست دەکەیت، کەس نیە سۆراخی دەنگی پیری پەنهانزان و خۆی بکات. تۆ میرغەزەبی هەینێ و هەقایەتخوانی هەوکە هەرچی دەیڵێی دوورنیە

راست بێت، تۆ چەند مکورِی لە سەرئەوەی ئەو شەوە لەو کۆڵانە کورتەوە تەنها یەک دارەبازە خرایە سەر ترومبێل و بەرەو گۆرِستانی گەورە کەوتە رێ. من دەڵێم بیربکەوە، رەنگە دوو دارەبازە بەرێکەوتبێ بەرەو گۆرِستانێک یان دوو گۆرِستان. بیربکەوە رەنگە بە هەڵە، هەواڵیان گەیاندبێت! چەند لاملی تۆ، ملنادەیت و سووری لە سەر قسەی خۆت.

ئەز تا درەنگیش هەر وا تێگەیشتبووم، گۆرِی پیری پەنهانزان کەوتۆتە نزیک گۆرِی هەڵدراوە، گۆرِی دزراوی ئەستێرەکەی من. من هەر وا تێگەیشتبووم، ئەو دووە پێکەوە، لە یەک شەو گیانیان سپارد و گەیشتنە گۆرِستانی گەورە. ئەستێرەی من بە سەر منداڵەوە و ئەویش لە بن قامچی میرغەزەبان. بەڵام پاشتر کە سەردانی سەر گۆرِی هەڵدراوەی دزراوی ئەستێرەی ژنمم دەکرد، زۆر جار لە سەر گۆرِی پیری پەنهانزان چەند ژنێکم دەدی، لە خۆیان دەدا و ناوی ژنێکیان دەهێنا. من کەسم لەو ژنانە نەدەناسی، کەسیان کەسوکاری پیری پەنهانزان نەبوون، دەمویست پێیانبڵێم:

خوشکینە، ئێوە لە سەر گۆرِێکی هەڵەن، ئەوە گۆرِی پیرەمێردەکەی دراوسێی منە.

زمـــانم دەگیـــرا و دووردەکەوتـــمەوە. کـــاتێ لە زارانیشـــەوە بیســـتمەوە لە کـــاتی گیانـــدانێ چەنـــد ئەســـتێرەیەک لە ئاســـمانێوە دێـــن و دەوری پیـــری پەنهانزان دەدەن و لە چاوان بزری دەکەن. کەوتمە گومـــان و گـــوتم پێـــدەچێ پیـــر بەرەو گۆڕســـتان نەچووبێت، یان رێی گۆڕستانێکیتری گرتبێت.

حەیـــف، نە مـــاڵی پەنهـــانزان کەســـیان مـــاوە. نە دەرودراوسێ لێرە ماون، نە کەسوکار شتێکی وایان لەبیرمـاوە. مـن روو لە کوێ بکەم و لە کێ پرسـم، پیری پەنهانزان چووە نـاو دارەبازە؟ ئـان ئەسـتێرە بـۆی بـوونە دەســتەبەرە و هەڵیـانگرت و بردیـان و کردیانە ئەستێرە؟ دەبێت لە ناو ئەستێران بە دوایدا بگەڕێین. نەوارەکانیش ئەگەر بن دەستوپێ، بن خۆڵ و خشـــت نەکەوتـــبن، لە کـــن پەڕەکاخەزەکـــانن، لە بـــاخەڵی هەواڵگـــرانن، وەک ئەوەیە لە ئاســـمان بـــن. هێنانەوەی ئەستێرە ساناترە لەو نەوارانە..

+ تـۆ وریـای ئەو نەوارانەی خـۆت بە، بـا دەنگی ئەبوو نەجمیش بە دەردی هی پەنهانزان نەچێت.

- تۆ راست دەڵێیت.

***

قسەی کۆنە زیندانیە، من لەسەرمە وەک چاوم بیانپارێزم. ئەو نەوارانە پوختەی دیرۆکی پیری پەنهانزانە لە زاری میرغەزەبێکەوە. ئەگەر خۆی پەیدانەبێتەوە لە نووکەوە خۆی نەگێڕێتەوە، لە دەنگی ئەبوو نەجم و ئەو سێ چوار کۆنە زیندانیەوە دەچێتە ناو دیرۆک و بە زیندوویێتی دەمێنێتەوە. وا چاکە لە بارەی گۆڕی ئەستێرەشەوە هێندە سەر نەنێمە سەر ئەبوو نەجم و کەمتریش بە ئاقاردا بیگێڕم. باشترە پتر گوێی بۆ رادێرم و کەمتر قسەی پێببڕم.

+ تۆ دوا قسەی پیری پەنهانزانم بۆ بڵێوە.

- ئەوەی گۆتم هەر ئەوەیە، دەستی خۆی دەشکاندەوە و دەیگوت:

بە زۆر رانەگەیشتم، جێی زۆریانم نەدیتەوە، هەندەک پێیانڕاگەیشتم بەڵام بە قسەیان نەکردم، هەشت نۆ دەیەکیشم لە مەرگ پەڕاندەوە.

## ١٣

گێڕانەوە هەر لە خۆی دەوەشێتەوە. دوای وی کەس سەربردان نەگێڕێتەوە. ئەو پیاوە لە ئەسپسوارییش بە وێنەی قسە سوارچاکێکە نەبێتەوە. ئەوەتا سواری ئەسپەکی شینی کەوێتە. سیروان و سیروان، باڵی گرتووە. پێی بە زەویەوە نەماوە. سوار دەستی بە بژەوە و دژە زێ و با پێی لە ئاوزینگێ ناوە.

دەیگاتێ، لە دوورەوە بە هەوریی سەری دەیناسێتەوە. هەوە کوڕی عەبابەیلێیە کە بەر چەند شەوێک شەقاوی گەورەی بەرەو زێ دەنا. ژنێک پێدەچوو ژنی بێت، خۆی پێوە شۆڕکردبۆوە. لێی دەپاڕایەوە لە زێ نەدا. لەوبەریش عەبابەیلێ باوەشی کردبۆوە. هەوە، لێ بۆ دڵنیایی پتر دوای چاکوچۆنی دەپرسێ:

ئەرێ، تۆی دەڵێی:

ڕێگەی ئاسن دەچێتە خاکی هەورەمانەوە؟

منم، سواری خوێندەوار، بڵێ، لە کوێوە دێی؟

دەڵێ:

لە بنی دنیاوە، لە نێوان دوو زێوە دێم.

خەونە ترسناکەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. دڵ تریواندنی خۆی بۆ باس دەکات، کە ساڵی یەک جار دەیبینێ و تووشی دەبێت و بە راستیش دەگەڕێ. پێیدەڵێ:

عیزرائیلـــی تــۆ لەو بەری ســـیروان چـــاوەڕێتە، نەکەی بپەڕیەوە.

کـوڕی عەبـابەیلێ تفەنـگەکەی لە شـانی دەهێنێـتە خوارێ و دەڵێ:

هەر کەسـێ نیـازی کوشـتنی منـی لە سـەر بێـت، پـێش سـێرەگرتن، پێـی دەخـزێ و بە زێـدا دەچـێ. شـێتۆکە، ئەو رێـیە دوورەت لە خـۆڕا بـڕی، بەڵام شەو مێوانی منی، بڕۆ ماڵمان تا دێمەوە.

پیـری پەنهـانزان ئـاهێکی درێـژ، لە ئەسـتێرەی کاکێشان درێژتری هەڵکێشا:

گەلەک لە کـوڕە قـۆزەکەی عەبـابەیلێ پـاڕامەوە، نەچـی لە زێ نەپەڕیەوە، لە دەسـتدەچی. بە دەردی

عیرفانەکەی ئەویٚ ساڵێ دەچی. دنیا و عەبابەیلێم بە گژدا کرد، تکای کەسی نەگرت. لە ڕێی گەڕانەوە پەلە هەورێکی زیل هەواڵی کوژرانی پیاوێکی کەناری سیروانی هێنا. لەویٚ بیرمکەوتەوە، لە خەونەکەش ئەو پەلە هەورەم دیتبوو. دیتبووم لە کەلێنی دوو پەلە هەورەوە ئەستێرەیەک ڕژا و شیعر لە شێوەی وردە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ بەردەبوونەوە.

+ ئەبوو نەجم لە بارەی عیرفانەوە چیتری نەگوت؟

- نا، پێدەچوو بە هانای ئەویشەوە چووبیٚ، بەڵام گوێی لێنەگرتبیٚ.

+ ئەبوو نەجم، ئەدی کێی لە مردن ڕزگارکردووە؟

- زۆر، بەڵام کەمیانم لەبیرە. خۆزگە نەوارەکانمان دەدیتەوە، هەینیٚ دەتزانی کیٚ و کێی لە سەر لێواری مەرگ گەڕاندۆتەوە.

سەربردەی مەلا و مەلاکان، ڕەنگە لە دوا نەوار بێت و دوا سەربردەی پیری پەنهانزان بیٚ. مەرگ گەیشتبووە سەر سینگی هەر ئەوەتا هەناسەی دەدا،

لە سەر رژان بوو، لە هەندێ جێ هێند پچڕپچڕ گێڕایەوە، چەندی لێکمان گرێدایەوە، یەکیان نەگرتەوە:

رۆژی پێشتر دڵم تریواندی، وەکات بەڕێکەوتم. ئێوارە درەنگ گەیشتم، ئەستێرەی سیوەیل بە ئاماژەیەک رێی نیشاندام، لێ رێیاننەدا نزیکببمەوە... مەلاکانم یەک یەک دی، بەژنیان لە باینجان دەچوو، سەریان لە قەندی شەکرێ... بەرۆکی گرتم و رایوەشاندم، قۆپچەی کراسەکەم بە دوای یەکدا غلۆربوونەوە... ئەگەر ئیزرائیلی، بڵێ، با بچم خۆم کۆبکەمەوە... بگەیێ مەلاکان مەلا دەکوژن...لەوێ بە دەرۆزەکەرم تێگەیشتن، چەندی گوتم مەلا مەلا...لەهیکڕا ئاگر لە هەنیەم هەڵبوو، ئەرێ... چاو دەکەمەوە، نازانم لە کوێم، کەس ناناسم...

چاوم گێڕا، ناسیمەوە. چایەچیەکەی ناو خەونێم ناسیەوە. پێدەچوو ئەویش من بناسێتەوە، ئاخر لە ناو خەونێ گەلەک قسەمان پێکەوە کرد. دوورنیە، ئەویش خەونی بە منەوە دیتبێت. چەندی کردم دەنگم دەرنەهات. زمانم نەگەڕا، بە زمانی ئاماژە تێمگەیاند، تێگەیشت. ئاخر لە خەونێش بەو زمانە قسەم لەگەڵی کردبوو. هەر دەبێت ئەویش

خەونەکەی دیتبێت. نەمدیت بەڵام گێڕایانەوە، مەلای گەورەی خستە پەنای خۆی و مەلاکانیتریش هەر پشکەکیان فڕیە جێیەک. بە خۆشی خوێنی تێکەڵی پیاڵە و چایە بوو. خوێنی ئەوم بە باڵی کۆترێکەوە دی. بەغدا، ئیدی یەک وشەی دی لە زاری منەوە نابیستن.

نەمانبیست، ئەو شەوە پیری حەفت گیان، نیو گیانێکی تێدا مابوو. کەڵکی زیندانی پێوەنەما، دەبوو بگاتەوە ئەو جێیەی لێیەوە هەڵگیرا.

+ئەو سەرە کۆڵانەی من تووشی بووم و هەڵمگرتەوە، ئەو شەوەی مامانم لەبیرکرد و ژن و منداڵەکەمم لە سەر دانا.

– تێدەگەم، لە سۆنگەی منەوە بوو، ئیدی...

+ واز لەوە بێنە، با بزانین کەسیتری لە لێواری مەرگ گێڕایەوە؟

کچ و کوڕەکەم جوان لەبیرە، لە پیری پەنهانزان جوانتر، بە دەنگ و ڕەنگەوە پاراستوومن، ئەها:

بابی کچە هێند دەستڕۆیشتووە، هێند بەسامە، حوکمەت خۆی لێ لادەدا. بە فیکەیێ دوو سێ تیرە

و هۆز دەست لە سینگ و چەک بە شان لە دەوری ماڵی ریز دەبەستن. ئەوجا بزانە کوڕە خۆی لە چی داوە! کچەش بۆ چ نەگبەتێ لێدراوە! بابی بە گوورپێژیش رایناگرێ.

دەستی یەکتر دەگرن و دێنە شار و پەنا دەبەنە ماڵی شێخی گەورە، کچە گوتبووی:

بابم خۆی موریدی شێخە و دەستی ئەوی بەستراوە و لە قسەی دەرناچێ.

شێخ هەرێی لە بابی کچە وەرگرتبوو کە نە لە زەویەوە نە لە ئاسمانەوە لەو ئاشقەوماشووقە نزیک نەبێتەوە.

ئەوجا با گوێ لە پیری پەنهانزان رابگرین داخوا چ دەڵێ:

بە چاوی خۆم ئەوانم دیت لە دەرگای ماڵی شێخەوە چوونە ژوورێ. هێندە لە ئێمەوە دوور نەبوو. ئەوەشم بیستبوو، هەرکەسێ پەنا بۆ ئەو ماڵە ببات، ئەگەر تەقەی لە سەرۆکی دەوڵەتیش کردبێ پارێزراوە و لە ترسی ئاگر و زەرگ کەس لەو ماڵە نزیکنابێتەوە. چوار دەوری ماڵی شێخ

بازنەی دەروێش و شیرە. بە ڕەزامەندی شێخ نەبێ، پشیلەش پێی بەودیودا ناچێ.

تۆ چاودێ، کونێکە بە حاڵ ڕێوی پێوەدەچێ. دوو زەلامـی گچـکەڵە دەمانچەشیان لە بەر پشـتێنییە، بە دوای یەکتـــردا، یەکیـــان هەڵـــدەقەنێ و ئەوی دی دەردەدات. لە ناو کەلاوەیەکی ئەودیوەی مـاڵی شـێخ چەنـد قـۆمەتە خـۆڵێ هەڵـدراوەتەوە. خـۆم گچـکە کـردەوە. هەر هێنـدەی گـوجیلەیەکی تـازە زاوم لـێ مایەوە. کون و کون کەوتمە دوایان. خۆم لە خۆڵێ لادەدا، بـڕۆ بـڕۆ، دەبـێ ئەو کـونە بـۆ کـوێ بچێـت؟ ئای ئێرە دەڵێی باخچەی مـاڵی شـێخە، هەوە، مـن لە سـەر بـانی خۆمـانەوە زۆر جـار لەو بـاخچەیەم ڕوانیوە. دەیناسمەوە، ئێرە حەوشە و باخچەی ماڵی شـێخە. ئەهـا سـەرێک لە بـن دارمێـوەکەوە دەڵێـی کـــوارگە هـــاتە دەرێ، بـــوونە دوو. ئەوەتـــا لەو پەنجەرەیەشـەوە کچە و کـوڕە دیارن. ئەهـا کەوتنە سێرەی دەمانچەوە، هەلاتن، فڕین.

تـا درەنگیش مـن هەر وا تێگەیشـتم ئەوەی دیـتم، تەلەڤزیـۆن نیشـانی دا و فـیلم بـوو. هێنـدەی لە فـیلم دەچـوو لە خەون نەدەچـوو. دوای خەونـێ چـوومە سـەر بـانێ. چـاوم لەو جێـیە بـڕی دوو سـەرەکەی

لێوە هاتنە دەرێ. دڵم تریواندی، لە دووی یەک تریواندی. تێگەیشتم ئەو دوو دڵدارە وا لە بن زەویەوە مردن دەیانگاتێ، بەر لە مردن لە سەرمە بیانگەمێ.

پیری پەنهانزانی حەفت گیان ناولەپێکی لە نێوچەوانی خۆی دا، زرچەی هات:

بەزمی ئەو کونە پار ئەو دەمە، برێک زووتر بوو، پیاوی ناو ئایەتان دەدرەوشایەوە، ئاوانەبووبوو.

ئەبوو عەلا خەوی دەهات، منی بە دیاریەوە بەجێهێشت و بە ئاماژە:

ئاگات لە نەوارەکە بێت.

پیری پەنهانزان کە پیری حەفت گیانیشی لێدێ، لە چاویڕا دیاربوو خەوی دێ، بەڵام پێدەچوو بیەوێ سەربردەی ماڵە شێخ زوو تەواو بکات و لە کۆڵی ببێتەوە، لە سەری رۆیشت:

دەروێشێکی شێخم دەناسی، ئەو دەروێشە چەند باوەڕی بە شێخەکەی هەبوو، سێ هێندە بە من. تێمکردەوە و تێمگەیاند، چاوت لە بن دارمێوەکە

بێت. شیر لە خۆت نەکەیتەوە. ئەو یەک دوو شەوە چاوت نەچێتە خەو. بزانە دوو جندۆکە لەهیکرِا لەو بن دارە دێنەدەرێ. ملیان پەل نەدەیت، هەرایەکی گەورە دەنێینەوە. شێخ دەبەن و ئێوە سەرگەردان دەمێننەوە.

دەروێش ئێشکگریی گرت و ئیدی ئەوەی بوو، بوو..

پیری پەنهانزان خەو بردیەوە، بەڵام نەکوژایەوە. ئیدی دوا پنتی بۆ ئەو سەربردەیە دانا و چیدی نەهاتەوە سەری.

***

وایە، ساڵی پێش ئاوابوونی پیاوی ناو ئایەتان، سەربردەی کوشتنی جندۆکە، گەڕەک گەڕەک، کۆڵان کۆڵان بە شاردا بڵاوبوویەوە. گەڕەک گەڕەک گۆڕانی تێدەکەوت و شێوەی جیای وەردەگرت. لە گێرِانەوەی گەرِەکە لاچەپەکان، دوایوەی دەروێش جندۆکەی یەکەمی لە بن عەردەوە هاتوو دەکوژێت، جندۆکەکی دی غاردەداتە هۆدەی کوڕ و کچەکە، بەڵام دەروێشی تەڕدەست شیرەکەی دەهاوێ و ملی جندۆکە پەلدەدات. لەو دەمە یەک دوو پشکە

خوێنی جندۆکەیان بەردەکەوێ و وەکات دەبنە دوو ئەستێرە و وەک گوللەی گڕدار ڕێی ئاسمانێ دەگرن و تا ئێستاش هەموو ساڵێ لەو شەوە بەهاریە، ڕێک لە سەر ماڵی شێخ، لە بڵندایی چەند منارەیێ، دوو ئەستێرە لە شێوەی کۆتری سپی هەڵدێن و کەم زۆر کەم دەمێننەوە. دەندووک دەگەیەننە یەکتر و ئاوادەبن. کەم کەس ئەو ئەستێرانەی دیتووە.

کەس نیە لەو شارە سەربردەی کوشتنی جندۆکە و بوونە ئەستێرەی نەبیستبێت، بەڵام کەس نەیزانیبوو، ئەو سەرهاتە لە بن سەری پیری پەنهانزانی ئەستێرەیە.

## ١٤

ئەستێرەکە تا هەڵات، زۆری پێچوو. هەر بە ناو ئەستێرە بوو، لە چ ئەستێران نەدەچوو. بە سەر دەریا و بیابان و دەشت و چیاوچۆڵدا نەهاتبوو. وەک دەڵێن بە ناو کتێباندا هاتووە. پەڕ پەڕ هەڵیداونەتەوە. درەوشانەوەی لە کتێبان وەرگرتووە. کتێبێک لەوانەی سەری پێداگرتووە قورئان بووە. لە دەو ئاوی نیلی پەڕ پەڕ تیشکی لێ وەرگرتووە. ئایەت ئایەتی لە زێ هەڵکێشاوە و بە خۆیەوە کردووە. لەوێوە تا گەیشتەوە ئێرە و لە سەر ئەو لادیوارەی قەڵاتێ نیشتەوە، بە ناو کتێباندا هات.

ئەو چەند دێرە لە سەر دەرکەیەکی داری بە شمشێری شمشێر لە سەر نەخشاو نەخشابوو. بەر لەوەی دەرگاکە بە دیوارەوە باربکرێ و کەس نەزانێ گەیشتە کوێ، ئەو وێنەگرەی کە وێنەی ئەستێرەی لە سەر مەچەکی کوتابوو، وێنەیەکی گرت و بە بەرۆکی دیرۆکیەوە کرد.

***

مەچەک کـــوتراو بە ئەســـتێرە دەگەڵ مـــن لە زیندانییە. لێرە نـاوی بـۆتە ئەستێرەدار. هـۆڕ هـۆڕ دەگریێ، بۆ ئەستێرەکانی دەگریێ. پێدەچێ ئاسمانە پـڕ ئەســتێرەکەی پێـیەک پـێش خـۆی گەیشـتبێتە زیندانێ. چاودەنێ، ئەستێرەدار ئاسمانێک ئەستێرەی کـــۆکردۆتەوە و خســـتوونەتیە ئەلبـــوومێکەوە و ئەلبـــووم بــۆتە ئاســمان. ئەســتێرەدار دەگریــێ و ئەستێرەکانی دەژمێرێ. ئێمە نـا، بەڵام ئەستێرەدار ئەستێرەکانی خـۆی دەبینێـت. بە بەر دەمیـدا تیـژ تێـــدەپەڕن و وەک گوڵەســـتێرە دەدرەوشـــێنەوە. دەستیان بۆ دەبات و ناگیرێن. بەناو بانگیان دەکات. ئەستێرەکانی وی نـاوی خـۆش خۆشیان لێیە. ئەوە کـوڕی خەزاڵـی چـاو ئەسـتێرە، ئەوە پیـاوی نـاو ئایەتان، کوڕە ئاڵا، لاوکبێژی سەر قەوانێ، دوا داود، کچە فەلە، کوڕی عەبابەیلێ، سەرگەردانی خەندەی بـایی، زۆرن زۆر، ئاسـمانێک پتـرن. یەکیـان نەبـێ نـاوی خـۆی ئەستێرەیە و بە ئەستێرە نـاوی دێنـێ. جاروبـــار قەڵاتیشـــی لەگەڵ دەڵـــێ. ئەســـتێرەدار ئاســـمانێک ئەســـتێرەی بە زینـــدانێ وەرکـــردووە، هاواردەکات:

بۆم بگرنەوە، ئەستێرەکانم بگرنەوە، تەمەنێکم لە خڕکردنەویان بە سەربرد.

دێـن، دوو سـێ میـرغەزەب دێـن و بە تێهەڵـدان دەیبەن. گوێمـان لێیە، تـێکەڵ بە زرچەی قـامچی و زللەیە، ((ئەستێرەکانم ئەستێرەکانم...)) بەرزدەبێتەوە و نابڕێتەوە. کوتکوتی دەکەن و دەیهێننەوە. دەوری دەدەیــن. بە هەوا برینــی بــۆ تیمــاردەکەین. هەیە یاسینی لە سەر دەخوێنێ. هەیە بە دەنگی نزم ئەی شــەهیدانی بـۆ دەڵـێ. ئەسـتێرەدار چاودەکـاتەوە، چــاودەگێڕێ، بە دوای ئەســتێرەکانیدا دەگەڕێ. بە ئامــاژەی ســەری پەنجەیـڕا دیـارە دەیـانبینێتەوە. ئەستێرە راکردووەکان وەزمانی دەهێننەوە:

بیانگرنەوە، رۆیشتن.

ئەســــتێرەکانی ئەســــتێرەدار نـــــاگیرێنەوە. ئەسـتێرەداریش وەک منـداڵ گڕنـاگەی داگرتـووە و دەگریـێ و ئەستێرەکانی دەوێتەوە. رۆژ نیە جارێ دوو خــۆی بە دارکــاریکردن نەدا. وازنــاهێنێ و نـاهێنێ. بەر لەوەی لە سـەر رانـی مـن چـاو و زاری دابخــات و بیــبەن و ئەســتێرەکان بکــوژێنەوە، نیوەشــەوێک شـتێک لە ســەربردەی ئەسـتێرەکانی گێڕایەوە:

یەکەم ئەسـتێرەی مـن کـوڕەکەی غەزالـی چـاو ئەسـتێرەیە. ئەوەی بە هەڵاتنـی وی، عەجەم چـاوی

خۆیان دەگرت. لێرە، لە بن شار، ڕوو لە چیا پشت لە شار، لە سەر ئەسپێکی باڵدار کە زینەکەی لە کەرتکە مانگ دەچوو، وێنەی گیراوە. وێنەکەم لە ماڵە قەلاتیەک دەستکەوت. لەو ئەستێرەیەی کە لە پەڕەشووتەوە هات، بە هەڵە لەو دیوی زێ کەوتە سەر زەوی. ناویان لەو ئەستێرە نا کوڕە ئالا، ئەوەی هیتلەر خستیە ناو پەڕەشووتێ. وێنەی کوڕە ئالا دوای ئەو دەمەیە کە لە بەغدایێ خرابووە بیرێکی قووڵ. لەو بیرەی یووسفی کەوتێ قووڵتر و تاریکتر، شەمشەمەکۆرە دەوریان داو دەمیان پێوەناو و تیشک تیشک مشتیان، چۆڕبڕیان کرد. ئەوە بوو ناردیانەوە ئێرە و شێتانە بە دەوری قەلاتێدا دەسووڕایەوە. وێنەکە هی سەر کۆسپەی دەرگای دیوی ئەستێرەی سیوەیلە. دوا ئەستێرەی ئاسمانی من پیاوی ناو ئایەتانە. ئەوەی خۆی لە زێی نیلیش هەڵکێشابوو، ئەوەیانم بە دەستی خۆم گرت و لە سۆنگەی ئەویشەوە بە ئەستێرەوە کەوتمە ئێرە.

+ مەبەستی ئەستێردەردار...؟

– لە گوینە، ئەستێرەکان تێکەڵن، دەڵێی کاکێشانن، من سەرەدەریان لێدەرناکەم، قەڵاتیش ئەستێرەی زۆرە.



کوڕە زیندانیی ئاشنای ئەستێرەدار، نە ئەبوو نەجم دەناسێ نە پیری پەنهانزان. ئەبوو نەجمیش شتێک لە بارەی ئەو کوڕەوە نازانێ. ئەستێرەداریشی بیرناکەوێتەوە. وەک ئەوەی پێی بە زیندانەکەی ئەو نەکەوتبێت، کەچی هاوزیندانیانی باشی دەناسنەوە. بە گۆریە برینی یەکتریان پێچاوەتەوە، پێکەوە لە سەر بێرۆکە شیویان خواردووە، لە ناو پێڵاوی لاستیق ئاویان خواردۆتەوە. ئەبوو نەجم لە کوڕی لە کن ئەستێرەدارەوە هاتوو هەندێ شتی بیرکەوتەوە:

وایە، من بە دەستی خۆم لە بنە پێڵاوێ، بە زۆری زۆردارەکی ئاوم دەرخواردی زۆر کەس داوە. شۆربای ناو تەنەکەی زبڵم لە بەر دەم بەندیان داناوە. چووزانم... دوای مێوانداریی پیری لاوک، تۆ بڵێ پیری پەنهانزان، لە کەلێنی شیشی پەنجەرانەوە ئەستێرە چاویان لێم زەقکردۆتەوە و تا هۆدەکەی

ئەبوو عەلا بە گورگە لۆقە هەڵاتووم و بەسەر خۆم نەهێناوە.

دوایوەی قامچی پیری پەنهانزانی هێنایە گۆ و دەستمان بە تۆمارکردنی پاکانەکەی کرد. بە درووداو کوڕە ئاڵای گێڕایەوە. چۆن لە پەڕی ڕەنگاڵە و بژی ئەسپەکی کەوێت و لە سەر ئەو مادەیەی کە دەیانگوت لە دایکی زەردەشتەوە ماوەتەوە و دەستاودەست هاتووە. ئاڵایەکی نەخشاند، ئاڵایەک لە ئاڵای چ وڵاتان نەدەچوو.

کوڕە ئاڵا، ئاڵا هەڵیدەگرت، خۆی دابووە دەستی با، ئەستێرە و ئەستێرەی دەکرد. دەبوو لە هەر ئەستێرەیەکەوە تیشکێ لە ئاڵا بنەخشێنێ. نەخشاندی و لە ئاسمان ماندوو بوو. زەویی بیرکەوتەوە، دەمێک بوو لێی دوورکەوتبۆوە، ڕێی زەویی پێنەدەزانیەوە، خۆی دەخیلی فڕۆکەیەکی هیتلەر کرد، فڕۆکە پرسی:

بڵێ، لە کوێ دادەبەزیت؟

کوڕە ئاڵا گۆتبووی:

ڕۆژهەڵاتی قەڵاتێ.

کوڕە لە ناو فڕۆکە خەوت، لە ناو پەرەشووتێ بەئاگاهاتەوە. لە جێیەک خۆی دیتەوە، نیشتەوە، جێی نیشتنەوە نەبوو. ئەو جێیەی زەوی، لەو دۆخەی هەوکە بۆ هەڵکردنی ئاڵا دەستنادات. بای شەکانەوە لە هیچ لاوە هەڵناکات. پیری پەنهانزان لە بارەی خەونەکەی خۆی و کوڕە ئاڵا ئەوهای گۆ:

لە خەونێ ناسیمەوە. بەرلەوەی بکەوێتە رێ، رێی ئەستەمبۆلێ بگرێ، ئەمن دیتبووم. لە کن عەلی فلەیح بە دیار قەوانی لاوکبێژەوە دیتبووم. لە کۆڕی گەرمی دوا داودیش دیتبووم. ئەو ساڵەی چووم بە هانای کوڕەکەی غەزاڵی چاوئەستێرەوەش لە کن ئاوی میری رووم لێنا و دەستی بە رووومەوە نەنا. ناسیمەوە، کوڕە ئاڵایە، ئەو کوڕەی ئاڵای بردە سەر ئەستێران. دیتم بە ئاسمانەوە دیتم. دوو هەڵۆ هەڵیانگرتبوو. بە ئاسمانیان ئێخستبوو. هەر دەستێکی بە پێی هەڵۆیەکەوە بوو. پێی دەتگوت کلکی ئەسپن دێن و دەچن. بۆینباخەکەی کە با هەڵیدابووە سەر شانی لە بژی ئەسپ دەچوو. دیتم، هەڵۆکان لە ئاسمانێ کەوتنە شەڕی ئێکترەوە. دەندووکی وایان لە ئێکتر دەدا، پشکە گۆشتیان بە زاریەوە بوو. بەڵام خوێنیش نەدەهات. خۆزی ئاسمان خوێنی لێدەچۆڕایەوە. خۆ خەونەکە بەتاڵ

دەبوو! شەڕە دەندووک گەیشتە دەستی ئەلەمانیش. دەنــدووکی وایــان لێــدەدا، نینــۆکی کــون دەکــرد. سەیربوو، لە پەنجەی ئەویش خوێن نەدەهات. لەپڕ هەڵۆکـــان ئاشـــتبوونەوە. لە ئاشـــتبوونەوەدا، ئاشتبوونەوەیەک کەس باوەڕی نەدەکرد پێش کەمێ ئەوانە دوژمنـــی بـــابە کوشـــتەی یەکتربـــوونە. لە ئاشـتبوونەوەدا نیشـتنەوە. لە نیشـتنەوەدا کوڕە ئاڵا کەوتە نـاو ئـاگرێ. لە نـاو ئـاگرێ سـێ کەسیدیشـی لەگەڵ بــوو. ئەوەبــوو، بە رووتوقــووتی هەڵاتــن و خۆیـان گەیانـدە رۆژهەڵاتـی شـار. لەوێ مـن دەبوو بگەمێ، گەیشتمێ. لە خەونەکە کەسێک دەنگی زۆر لە دەنگی خوداوەند دەچوو، من پێشتر قسەم دەگەڵ خوداوەند کردبوو، گوتی:

هیزە، بیگەیێ، نەکا، خۆی رادەستبکا.

من دەبوو زووتر بگەمێ، پێش نیشـتنەوە بگەمـێ. بەڵام دەنگـم نەگەیشـتە ئاسمانێ، تـا بڵـێمە شـوفێرە ئەلەمـــانیەکە، نەکەی، کـــوڕە نەکەی، ئێـــرە جێـــی دابەزینی ئەستێرە نیە. نەگەیشتێ، دەنگم نەگەیشـتێ. ئێ، ئەوە ئێستا گەیشتمێ، لە بن سـێبەری کۆمەڵێک داربیی دەو کارێزێ گەیشتمێ. خەون و دڵتریواندنی خۆم بۆی گێڕایەوە و گۆتم:

خۆت رادەستکەی، بە ئاڵاوە لە ناو ئاونێ کوتکوتت دەکەن.

گریا، مینا منداڵی داکۆنی، مینا منداڵە قەڵاتی گریا و گۆتی:

من بەڵاگێڕم، نابێ خەڵک ببنە بەڵاگێڕی من.

ئەو خواگیرە بە قسەی نەکردم. کەلەپچەی ئینگلیزیان کردە دەستی. شیری عارەبیان خستە سەر ملی. هەڵیاندایە کونەڕەشەی بەغدایێ. لەوێشەوە لە ئاڵا و تیشک رووتیانکردەوە و ناردیانەوە قەڵاتێ.

## ١٥

ئەو ئەستێرەیەی لە سەروبەندی رژانی خۆی، چەند کەسێکی ناردە زیندانێ. یەک بووە پیری پەنهانزان و یەک بووە ئەستێرەدار و یەک... ئەو ئەستێرەیە، لە ناویش لە ئەستێرەکانی دی ناچێ. وەک ئەوان ناوی مرۆڤی لە خۆی نەناوە. لە چ ئەستێران ناچێ، جوایەزە، کەس نازانێ چەند چوکلەیە و تیشکی چەند ئەستێرەی تێدا دەدرەوشێتەوە. بۆیە هەر دێرێکی سەربردەی وی لە کن کەسێکە. کەس نیە ئەو ئەستێرەی دیتبێ و لە بارەیەوە قسەیەکی نەبێ، نە پیری پەنهانزان و نە ئەبوو نەجم و نە کەس ناکارن تیشکەکانی نیشانبدەنەوە. ئەبوو نەجم لە ئەبوو عەلای دەگێڕێتەوە کە بە دیتنی وێنەکەی سامگرتوو بووە و چاوی خۆی گرتووە.

***

پەڕە کاخەزێکی لەپێشم دانا:

+ ئەو پیاوە ناناسیت؟

– گەورەم، ئەگەر ئەوە بێـــــت کە بە دیـــــار قەڵاتەوەیە، لە نزیکەوە دەیناسم.

+ هەوە، وێنەیەکی تازە و روونی ئەوم گەرەکە.

ئاسانە، ئاشنایە، کەم شەو هەیە نەیبینم. بەڵام لەو دوورەوە چـۆن وێنەیەکـی بگـرم، وا روون و گەش دەرچـێ. سـەر لە ئێـوارەیەک ئاسـمان چەنـد پەلە هەورێکی تەنک لە شێوەی دووکەڵی سپیی پێوەبوو، دەرکەوت، وەکـات سـێ چـوار وێنەمـان گـرت، لە وێنەیەکیان کە زۆر لە نزیکەوە بوو، حـاجی لەقلەقی سەر منارەکەش دەرچووبوو. ئاماژەم دا وێنەگرەکە وێنەیەک تەنێ رووی ئەو دەرچێ.

لە دەمی ماڵاوایی گوتم:

رۆژ دوای رۆژ درەوشاوەتر بیت.

بزەیەکی هاتێ و گوتی:

دڵم دەڵێ دەمی رژانم هاتووە.

ئەو وێنەیەم دایە ئەبوو عەلا، لە سەر مێزەکەی دانا و سام گرتی و چاوی خۆی گرت و دەستی بە ورێنە کرد:

ئەو هەموو تیشکە! چیە، پرچی چی گرتووە؟ دەڵێی وردە ئەستێرە خۆیان پێوە هەڵواسیوە.

وەک ئەوەی سێ چوار کەسێ دەوریان دابێت، کەوتە دەستڕاوەشاندن و خۆ راپسکاندن. تێنەگەیشتم چ باسە، بە تەنیا جێمهێشت و چوومە هۆدەکەیدی. لەگەڵ خۆم کەوتمە ورتەورت، باشە ئەو وێنەیە بۆ وای لەو پیاوە کرد! ئەوە کێیە؟ وا ترسناکە! ئەبوو عەلا هیچی نەگوت.

ئێوارەی دواتر هەردوو ئەستێرە، پیاوی ناو ئایەتان و پیری پەنهانزانم دیت، شان بەشانی ئێکدی دەڕۆیشتن. بە چاوێکی دی روانیمە ناو ئایەتان، بەڵام هێندەی سەرەدەرزیەک گومانم لە هی پەنهانزان نەکرد.

رۆژی پاشتری بە دوای مەلاکانیدا نارد.



سەلامی چەپم دایەوە. ئەفەندیەک لە سەر سەرم راوەستابوو، پێدەچوو لە پشتە من نوێژی دابەستبێ. بە زمانی قورئان گۆتی:

لەگەڵمان وەرە، کەمێ کارمان پێتە.

لە بن چاکەتەکەشیەوە، دەسکی دەمانچەکەی پیشاندا. بوونە دوو سێ کەس. بێ بێنەوبەردە بەگەڵیان کەوتم. چەندی سەرم هێناوبرد، شتێکم لە خۆم شکنەبرد. لە چ گوتارێ، لە چ دانیشتنێ پلارێک، شتێکم لە سەرۆک نەگرتووە. نە لە من فزەیەک نە لەوان ورتەیەک، باژۆ. کاتێ لە سەر پێبلکەکانی سەرا خۆم دیتەوە، ئاهێکم بە بەردا گەڕا. ئۆخەیش، خۆ نەیانبردمە (ئەمن)، لەوێ تووشی پێنج شەش مەلا بووم. دوور و نزیک دەمناسین. تێگەیشتم شتێکم نەکردووە، بەڵام دەیانەوێ شتێک بکەم.

بە ریز دانیشتووین، مەلایەک بە زمانی قورئان دەدوێ. ناوە ناوەش ئایەتێک و فەرموودەیەک و گوتەیەکی سەرۆکی پێدا دەکات. تێبینیم کرد لە گۆتنەوەی گۆتەکانی سەرۆک هەڵەناکات. بەڵام لە ئایەت و فەرموودان هەڵەی وا دەکات، فەقێی تەمبەڵ نایکات. یەک دوو جار ویستم هەڵدەمێ و

بۆی راست بکەمەوە، خۆم کڕکرد. مەلای سەر مێزێ زۆری ڕێسا. لەپڕ کتێبێکی دەرهێنا. من کتێبەکە نا، خاوەنی کتێبەکەم ناسیەوە، گوتی:

لەو کتێبە سووکایەتی بە ئێوە، بە ئێمە، بە خۆشەویستی خواو و موسڵمانان کراوە. ئێوە چەند کەستان خوێندووتتانەوە؟

کەس دەستی هەڵنەبڕی و ورتەی لێوە نەهات، مەلا کەوتە سەرکۆنەکردنمان:

ئێوە، نەوەکانی سوڵتان موزەفەر، ئەو سوڵتانەی محەمەدەلموستەفای لە دزین، لە فەرامۆشکردنی ڕۆژی هاتنەدنیای ڕزگارکرد. چۆن دەبێت ئاگاتان لە گومڕایەک نەبێ کە لە بن پێلتانەوە قیتدەبێتەوە و بەگژ ئێوە و پەیامبەردا دێتەوە، شارەکەتان دەکاتە تاریکستان!

هەندێ ڕستەی ناو کتێبەکەی بە زمانی خۆی بۆمان خوێندەوە. ئەوجا پرسی، یەک یەک لێمانی پرسی:

تۆ دەڵێی چی، چی بکەین باشە؟

هەر کێ ڕاستبۆوە گۆتی:

ئەوە داخوا چ عارەقخۆرێکە، چ شوعییێکە! لە سەری ناچێ. چ لە سبەینێ زووتر نییە، لێی لە هەڵادەدەم، دەیکەمە سۆدرەی دنیایێ.

نۆرەی وەلام گەیشتە من، گۆتم:

من تا کتێبەکە نەخوێنمەوە، چ ناڵێم.

زاری هەڵێنا، قسەم بڕی گوتم:

مامۆستا، ئەگەر رێمبدەی، تۆ لە هەندەک ئایەت و فەرموودان هەڵەت کرد.

بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ئەدی ناڵێن، مەلاش هەڵەدەکات! دەی باشە، تۆ کتێبەکە بخوێنەوە، ئەوجا لە بارەیەوە قسەی خۆت بکە و خەڵک لەو گومڕایە ئاگاداربکەوە.

سەر و دانەی داینێ و بەڕێیکردین.

خوێندمەوە، پەڕ پەڕ گەڕام، نازانم نە لە خۆشەویستیی خاوەنەکەی بوو، نە لە رقی مەلاکەی ناو سەرا، لاپەڕەیەکم نەدیتەوە سووکایەتی بێت بە من و خۆشەویستی خودا.

ئێوارەی دواتر پیاوی ناو ئایەتانم لە ڕێی خۆی لەو جێیەی دەیانگوت، هەموو ئێواران لێرەوە هەڵدێت، هەڵات و دیتم. هەند ڕووناک بوو، چاوم بە ڕوویدا هەڵنەدەهات. بەزمی مێزەربەسەرانی ناو سەرام بۆ گێڕایەوە، گوتی:

ئاگادارم، زۆر تیر بۆیان تێکوشیوم.

ئیدی من لەو ڕۆژەوە جلکی مەلایەتیم لە مزگەفتی بەجێهێشت و چوومەوە بەر مەڕان و پیاوی ناو ئایەتانم نەدیتەوە.

+ چەند مەلا فەتوای کوشتنی پیاوی ناو ئایەتانیان دا؟

– زۆر نەبوون، بەڵام دەنگیان دەگەیشتە ئاسمانێ.

+ هەموویان دەناسیەوە؟

– نا، هەندێکیان، ئەوەی زوو چووە هەندەرانێ، ئەوەی گەیشتە پەرلەمانێ، ئەوەی...

مەلای بەر مەڕێ ئەوەشی گوت:

مـــن پێشـــتریش لە کەلێنـــی گەلەک ئـــایەت و فەرمـــوودان تـاریکیم دەدیت. تـاریکیەک بە چ کتێبـان رووناهی تێنەدەکەوت. پەنـام بۆ پیـاوی نـاو ئایەتـان برد، کەلێنەکانم لێ بوونە چراخان.

❊❊❊

لە رێـی مەلای مزگەفتـی ریزی یانەکە ئاگـاداری خڕبوونەوەی مەلایانی ناو سـەرا بووم. دیتم، سـەر لە سبیانێ دیـتم بە قادرمەکاندا سـەردەکەوت، پـێش بانگـدانی نیـوەڕۆش بە رێکـکەوت دیـتم لە پـێش دەرگـای مـاڵی خۆیـان دایانبەزانـد. شـین و مـۆر هەڵگەڕابوو. تۆ بڵێی شتێکیان لێکردبێت! من جگە لە پرسـە بـۆ پێشـاویش پـێم نەخسـتۆتە حەوشـەی چ مزگەفتـــێ، بەڵام ئەو رۆژە بـــۆ پـــێکەوتن چـــووم. بانگدانەکەشی تووڕەیی پێوەدیار بوو. دوای نوێژێ، مەلا گوتی:

دوو سێ قسەم هەیە، هەرکەسێ حەز لە بیستنی دەکات، دانیشێت و نەڕواتەوە.

نیوەی پتر مانەوە. چاوم لێبوو مەلا بۆ لای تـاقی پـــێڵاوان چـــوو. لەوێ لە بـــن پێڵاوەکـــانی خـــۆی توورەگەیەکی گچکەی هێنا. لە پێشـە خۆی دانـا. بە

بێزەوە زارکی کردەوە. تیلمە پەڕۆکێکی لە بەرکی دەرهێنا. بە هێڵنجەوە دەستی خستە ناو توورەگەوە. وەک کلکی مشکی گرتبێ وابوو. بەر لەوەی زار هەڵێنێ، سێ چوار تفی لێکرد. زاریشی بە زەندیق هەڵێنا:

زەندیق وا لە ناومانە، بۆیە بەر غەزەبی خوا کەوتووین، تەماشاکەن.

تەماشادەکەم کتێبە، کوڕە خۆ ئەوە کتێبەکەیە، ناسیمەوە. چەند رۆژێکە خوێندوومەتەوە. بەر لەوەی ببێتە کتێبیش خوێندبوومەوە، بە دەم قوڕگپاککردنەوە، بەروپشتی کتێبەکەی نیشان دەداین. بە زمانێک دەتگوت خودا رایسپاردووە وا بڵێ:

لە شاری عوزێر پێغەمبەر، لە شاری سوڵتان موزەفەر، لەو شارەی هەناسەیەکی سەلاحەدینی تێدا بەجێما، ئەو سەلاحەدینەی دنیای پاککردەوە لە خاچپەرست و گومڕا و کوفر، لە شاری خێر، شاری مزگەفت و دینپەروەر، لەو شارەوە عارەقخۆرێکی سەرسەری هەستاوە، ئەها ئەو کتێبە گڵاوەی نووسیوە. هەر کەسێ دەستی بەری بکەوێ، لە سەریەتی خۆی ئاوەگڵبکات. من کە لەگەڵ خۆم

هێناومە بۆ ئەوەیە بیناسن. دەنا سەگ و مزگەفتیان نەگوتووە. ئەو کتێبە کتێب نیە، گووی سەگە.

کتێبەکەی بە تیلمە پەڕۆکەکەوە خستەوە ناو توورەگەکە. پێدەچوو پیسیی کتێبەکە لە تیلمە پەڕۆکەکەوە پەڕیبێتەوە پەنجەکانی، بۆیە بە فووێک پەنجەکانی خۆی خاوێنکردەوە. تێهەڵچۆوە:

ئەو زەندیقە عارەقخۆرە سەرسەریە، هەستاوە بەگژ پێغەمبەر، درووودی خودای لەسەر و بە گژ مەلادا چووە. قسەی بۆمان هەڵبەستووە. بوختان، بوختانی کردووە. دەک خودا لەناو دەوت دا پیاوی بوختانکەر، پیاوی زەندیقی فاسیقی مەلعوونی مولحیدی خوانەناسی داوێنپیسی عارەقخۆر، نابێت نا، لە شاری ئێمە ناکەسێک قیتببێتەوە جوێن بە خودا و پێغەمبەر و مەلا بدات.

هەستڕادەگرم، چاودەگێڕم ئەو خەڵکە هەناسەیان لە خۆ بڕیوە و یەکپارچە بوونەتە گوێ. بە خۆم نەوەستام و هەڵمدایێ:

مامۆستا، ئادەی هەندێک لەو کتێبەمان بۆ بخوێنەوە، بزانین چ شەکرێکی شکاندووە؟

مەلا مۆڕەیەکی لێکردم، پاش کەمێک دامان گوتی:

کاکە، ئەوە تۆ چی دەڵێی! دەتەوێ لە ناو ماڵی خودا، جوێنت بۆ بخوێنمەوە، جوێن بە خودا!

لە هەموو لاوە چاوی غەزەب کەوتنە سەر من. ویستم بڵێم مەلا تۆ ئەو کتێبەت نەخوێندۆتەوە، بیخوێنەوە. ئەگەر جوێنێکت دیتەوە، منیش لەگەڵ تۆ جوێنی پێدەدەم، نەمکرد. تێگەیشتم لە مزگەفتێ هەرچۆنێک قسەی بکەیت، دۆڕاویت.

مەلا درێژەی دایێ:

ئەورۆ درێژەی نادەمێ، با هەینی دابێ، هەینێ دەزانم چ هێرەیەکی پێدەکەم. وای لێدەکەم لەو شارە جێی نەبێتەوە. دەبێت تڕۆبکرێت. نا، نابێت لە دەستدەرچێ، پێویستە وەک سەگ بتۆپێنرێ. کوشتنی ئەو سەگە شووعیە ئارەقخۆرە حەلاڵە، هەر کەسێک بیکوژێت، دەستی کەسک دەبێت. بێ حەفتوهەشتێ بە پێلاوەوە دەچێتە بەهەشتێ. ها، ئەنگۆ چ دەڵێن، ناڵێن ئەو سەیەی بە خودا و پێغەمبەر و مەلا دەوەڕێ، با بتۆپێ؟

بەشێک لە خەڵکەکە، بە یەک دەنگ:

با بتۆپێ، ئەو سەیە بتۆپێ.

یەکپێ هەستام و بە دوایدا گەڕام. ئێوارەکەی ڕێک لەو جێیەی ڕژا، لێم هەڵات. بە تەنێ نەبوو. ئەویدیم نەناسی، بەڵام ئێستا دەزانم پیری پەنهانزان بووە. تیمکردەوە و چوونە سەرا و فەتوای مزگەفتێم بۆی گێڕایەوە. هەستمکرد ڕەنگی گۆڕا، تەواوێک داما و بە ئاماژە سوپاسی کردم و بەجێمهێشت.

دەڵێمە جوگرافیاناسی دیرۆکنووس:

تۆ گوێت لە وتارەکەی هەینی بوو؟

دەڵێ:

نا، ڕۆژی پێشتر گرتمیان و ڕاپێچی سەربازگەیان کردم.

دەڵێم:

کە زانی فەتوای کوشتنی دراوە، بۆچی خۆی نەشاردەوە؟

دەڵێ:

وا تێبگەم بە هەندی هەڵنەگرت.

***

ئەو سەر لە ئێوارەیەی رووبەڕوو ئەستێرەکەم لێ هەڵات، لە ناخەوە تووشی درەوشانەوە هاتم. پێشتریش دووربەدووری دیتبووم. زۆر جار دەهاتە سەرم وێنەیەکی بگرم، تیشک رێینەدەدا، رووم نەدەهات. قەرداری ئەو ئەفەندیەم ئەو ئێوارەیە بانگیکردم خۆی دایە پەنای تیشکی ئەو و چەند وێنەیەکم گرت. لەوەوە شەرم یان ترسم لە تیشکەکەی شکا و وێنەیەکی گەلەک جوانم گرت. لەگەڵ وێنەکی خۆم لە تەک یەکترم دانان و گرتمنەوە، دیسان و چەند جارێک، وای لێهات، هەر کێ دیتبای دەیگوت:

ئەوە چۆن گەیشتیە تەنیشت ئەو ئەستێرەیە؟

ئەمنەکە کاتێ کامێراکەی گرتم و جانتاکەی پشکنی شتێکی لەوانە نەدیتەوە کە بەدوایدا دەگەڕێ. دەیویست وازم لێبێنێ، چاوی کەوتە سەر وێنە دووقۆڵیەکە، من و ئەستێرەکە، هەڵوەستەیەکی کرد و بێ سێ و دوو قۆڵبەستی کردم و بردمی و ئەوە بوو ئەستێرەکانیماڵێشیان هێنایە زیندانێ.

تا ئێستا لە ئەستێرەدارەوە تەنێ ئەو چەند رستەیە بەجێماوە، ئەو چەند رستەیەی لە سەر بنەپێڵاوێک نەخشاندبوو، رەوانەی دەرێی زیندانی

کردبـــوو. لەو ڕۆژانە ژنەکەی لە لاپەڕەی حەوتـــی ڕۆژنامەیەک بڵاویکردبۆوە.

## ١٦

وا دیسان لە ئاقاریَ بە دوای گۆڕی ئەستێرەدا دەگەڕێین. ئەو کەرەتە جوگرافیاناسی دیرۆکنووسیشمان لەگەڵە. خەونەکەی دویَ شەوێی ئەبوو نەجم، ئومێدی بۆم گەڕاندەوە. ئەورۆ لەگەڵ وی چاو لە جێی خەونەکە دەگێڕین. دەڵیَ:

وێنەی جێیەکە لە هزر و چاوم روونە. لە دوورەوە دەیناسمەوە. جێیەکە کەمێک چاڵاییە، قۆمەتە خۆڵێک کەوتۆتە نێوان دوو قووچەکە بەرد. چوار پێنج پنچکە حووشترالووک دەوریان دابوو. رێک لە قۆمەتەکەوە ئەستێرەیەکی کەزیدار هاتە دەریَ. لە شێوەی گوللەی گڕدار، بیَ دەنگ تیشکی دەهاویشت. قووچەکە بەردەکان سووربوونەوە، حووشترالووکەکان هەڵکرووزان. ئەستێرە کەزیدارەکە لە بڵندایی دارتێل شتێک نەویتر رێی شاری گرت و من کەوتمە دوای.

ئەبوو نەجم دەڵیَ:

جوان چاو بگێڕن، بگەمە سەر قۆمەتە خۆڵەکەی ناو خەونێ، ئەستێرەت بۆ دەبینمەوە.

جوگرافیاناس دەڵێ:

لە دەرێی خەون بۆی بگەڕێ.

من بە خەونەکە دڵخۆشم و لە بڵندایی‌یش بە دوای چاڵاییدا دەگەڕێم. لە بستاییەک سەردەکەوم. چاڵاییەک هاتە پێشم. نزیکدەبمەوە، قۆمەتەخۆڵێ دەردەکەوێ. چەند پنچکە حووشترالووکێ دەوریان داوە. هێشتا قووچەکە بەردەکان دەرنەکەوتوون. تیشکێ هاتە دەرێ. بە کەزی ناسیمەوە ئەستێرەکەی خۆمە. ئەو دەمەی بە دوای ماماندا چووم، کەزیی بەو شێوەیە بەستبوو. هەوە، کەس ژنی خۆی نەناسیتەوە من دەیناسمەوە. سووکە ئاوڕێک دەداتەوە و پشتم تێدەکات و دەڕوات. بانگیدەکەم، دەکەومە دوای. ئەها ئەستێرەیەکیدیش لە قۆمەتەکەوە هاتە دەرێ و دایەوە دوای ئەستێرەی من. هەوە، دەیناسمەوە، بە ڕۆیشتن دەیناسمەوە، پیری پەنهانزانە. لەو ئاقارە کەوتمە دوایان. لە دوامەوە دەنگەدەنگێک دێ. تێناگەم چ دەڵێن. گەلەک خۆش دەڕۆن نایانگەمێ. پێیان بە زەویەوە نەما. بەرزبوونەوە، من لە دوایان نابمەوە.

گەیشتمە کوێ؟

چـــاودەکەمەوە، فریشـــتەیەک و دوو کەس بە ســـەرمەوەن. جوگرافیاناســـی دیرۆکنـــووس و ئەبـــوونەجم، فریشتەکەشـــم ناســـیەوە، بە چـــاوی ناســـیمەوە. بەڵام نـــاویم بیـــرنەکەوتەوە، پێشـــتر دیتبووم، دەستەخوشکی ئەستێرەکەی من بوو.

***

هەینـــێ مـــن لێـــرە نەبـــووم، بە خەمـــی خۆمـــدا کەوتبـــووم. لەو ســـەروبەندە پیـــاوەکەم گیـــرا و سڕگومکرا و نەمدیتەوە.

+ پیاوەکەی تۆش...؟

- بەڵێ.

لەو دۆخەی تێیکەوتبـــووم هەواڵـــی هەڵـــدانەوە و دزرانی ئەستێرەی هـاوڕێمم بیست. ئەمن یەکسـەر بیرم بۆ دکتۆرەکە چوو. نازانم بۆ تۆی گێڕابۆوە یـــان نـــا؟ ئەو دەمەی دەوروخـــولی دەدا و زێـــڕ و زیوی قەیســـەریی پیشـاندا، بەڵام جگە لە تف هیچی لێ دەستنەکەوت. بەوەت زانیبوو؟

– نا، ئا، شتێکی باسکرد، بەڵام بیرمنەماوە چۆن بوو.

+ با، دەزانم پتر نیگەران دەبیت، بەڵام نەیڵێم دڵم دەتەقێ، بۆ کەسم نەگێڕاوەتەوە:

هەرەشەشی لێکرد، بەڵام ئەو پێڵاوی نیشاندا. بیرمە جارێک بە پێکەنینەوە گوتی:

لە سەر دەرگا راوەستابووم، ئەو دکتۆرە خوێڕیە لە ناو ترومبێلەوە پەرە کاخەزێکی لوولدراوی بۆم هەڵدا و تیژ تێپەڕی. هەڵمگرتەوە، خوێندمەوە:

من مـن بم، سەرجێییت لەگەڵ دەکەم، بە زیندوویتی نا بە مردوویتی، لە ناو گۆڕیش بێت دەرتدێنم.

ئەستێرە پێکەنینی بە قسەی دکتۆرەکە دەهات، بەڵام من لەرزم پێگرت. ئاخر سەربردەی جاشە ناکەسەکەم بیستبوو، ئەوەی کچە عازەبەکەی بە مردوویی لاقە کردبوو.

گومانم لە دکتۆرەکە هەبوو، بەڵام نەوێرام بێمە لات و بۆت باس بکەم. باشم کرد نەهاتم، چ بزانم

دەستی ئەو تەرەسەی تێدایە، ئەگەر لە خەستەخانە دەمزانی ئەوە، پەلامارمدەدا و شرتوشۆم دەشکاند و بەگرتنمدەدا.

+ باش بوو، نەتزانی، دەنا چیرۆکی ئەستێرەکان دەپچڕا و...

- ئیدی خۆت دەزانی، بەڵام تکات لێدەکەم، چیدی ئەو ئاقارە لە دوای ئەستێرە مەکە، شێت دەبیت. تۆ خۆت نەدیت چیت بە سەر هات و چۆن گەیاندیانیە خەستەخانە.

بە دیتنەوەی ئەو فریشتەیە گەلەک دڵخۆشم، لە چاوی ئەوەوە تیشکی ئەستێرەکەی خۆم دەبینم. سەربردەی دکتۆرەکەش نەک هەر نیگەرانم ناکات، بگرە خەمی دزینەکەی کەم کردەوە. ئاخر خەمی بە هەڵە هەڵدانەوە سووکترە لە هەڵدانەوە بۆ لاقەکردن، ئێستا دەڵێم باش بوو ئەبوو نەجم زوو بەر لەوەی دکتۆرەکە دەستی بگاتێ، ئەستێرەکەمی بە هەڵە لە بن خۆڵ دەرهێنا و خستیەوە بن خۆڵ، ئەدی ئەگەر دکتۆرەکە لاقەی کردبا!

دەبوو زووتر دەستەخوشکەکەی ئەستێرەم دیتباوە و باسی مێردە شوێنبزرەکەی کردبا.

## ١٧

دەرگـــام تەواو نەکردبـــۆوە، نـــاولەپێ کە لە هـــی هرس دەچوو، زارمی گرت. لە چاوترووکانێ دەست لە پشـــــتەوە، بە ســـــتوونەکەی بەر بێـــــراییەکەوە بەستمیانەوە و بە سەرنانەکە توند زارمیان بەست. چوار پێنج زەلامی کەتەی باسک ئەستوور، بە مـالێ وەربـوون. کـاتێ رۆیشتن ئەلبوومی ئەستێرەکان و چەنـــد کتێبـــێکم بە دەســـــتیانەوە دیـــت. درەنـــگ دەرودراوســـێ هـــاتن و کردمیـــانەوە، دڵـــم گـــۆتی، پیاوەکەم گیراوە، وابوو، هەر ئەو گیرانە بوو.

+ کتێبەکان چ بوون؟

– یەکیان هەر ئەو کتێبە بوو کە مەلاکان لێیان لە هەڵادا، وێـنەی کتێبنووســەکەش لە نـاو ئەلبـوومەکە بوو.

+ئەها...

پیـاوەکەم نـاوی لەو ئەلبـوومە نـابوو ئەلبـوومی ئەستێران، زۆر جار پێمدەگوت:

با وێنەیەکی خۆم و خۆشت بخەینە ئەو ئەلبوومەوە.

دەیگوت:

نابێت، خۆ ئێمە ئەستێرە نین.

ئیدی ئەوە تایبەت بوو بە ئەستێران. بۆ ئەستێرەیەک دەچووە بنی دنیا. دەگەڕا هەموو جێ دەگەڕا. ئەو جارانەی بە دەستی پڕ دەگەڕایەوە، لە سەر دەرگاوە دەیگوت:

ئەستێرەیەکی دی هەڵات.

دڵی بە ئەستێرەکانی گەلەک خۆش بوو، بیرمە ئەو رۆژەی کتێبنووسەکە یان ئێوە گوتەنی پیاوی ناو ئایەتانی هێناوە، لە خۆشیا جێی بە خۆی نەدەگرت. هێنای لە تەنیشت پیرێک جێی بۆ کردەوە و گوتی:

ئێرە شایانی تۆیە، لێرە بدرەوشێوە.

+ پیرەکە کێ بوو؟!

– ئەستێرەیەک بوو، بە رۆژیش دەدرەوشایەوە.

+ پیری پەنهانزان نەبووبێت؟

- نازانم.

مێـــردەکەم ئـــاواتی بـــوو هەمـــوو کەس بە ئەسـتێرەدار نـاوی بێنن. بەڵام تـا نەکەوتە زینـدانێ سـەری لە سـەر دانەنـا، ئـاواتەکەی نەهـاتەدی. مـن بیـرمە دوو سـێ شـەوێ پـێش گیـرانەکەی خۆشـی بـووە ئەسـتێرە. لە لاپەڕەیەکـی کتێبـی پیـاوی نـاو ئایەتان، ئەستێرەداری مێردم بووە ئەستێرە. بیرمە لە تەنیشـت یەک راکشـابووین، کتێـبەکەش لە سـەر سـینگمان، چەنـد لاپەڕەیەکـی دەخوێنـدەوە، دەیـدایە مـن، دەمخوێنـدەوە و دەمـدایەوە، کتێـبەکە لە سـەر سـینگمان دەستاودەسـتی دەکـرد، ئـێمە زۆر کەڕەت بەو شـێوەیە کتێبمـان دەخوێنـدەوە، جـار هەبـووە کتێب لە نێوانمـان خەوتـووە، کـاتێ بەئاگادەهـاتینەوە لەیەکترمان دەپرسی:

گەیشتبووینە لاپەڕە چەند؟

لە دیتـنەوەی لاپەڕە دەبـووە کێشـە، ئەو دەیگـوت ئێـرە، مـن دەمگـوت نـا لێـرە راوەسـتابووین، لەوە پێدەکەوتین کاممـان زووتـر خەوی لێکەوتـووە. ئەو شـەوەی بـووە ئەسـتێرە لەگێـنە مـن زووتـر خەوم لێکەوتبێـت، کتێـبەکە بە دەسـت مـنەوە بـوو، لەو لاپەڕەیەی کە ئـایەتێکی سـوورەتی نـووری تێدابوو،

دواتــر نــاوم لەو لاپەڕەیە نــا لاپەڕەی ئەســتێرە، ئەوەی دەڵێ:

(الله نور السماوات والارض.....)

ڕێــک لە نێــوان نــووری ئاســمانێ و گلــۆپەکەی ئەدیســۆن، دیــتم ئەســتێرەیەکی گچــکە هەر بە قەد گوڵەستێرەیەک دەبوو، هەڵهات. ئەستێرەکە شــەوقی لەگلۆپەکەی سەر سەرمان بڕی. ئەستێرە بەرە بەرە شێوەکەی دەگۆڕا. گۆڕا گۆڕا، ڕێک شــێوەی مرۆڤــی گــرت. لێیوردبــوومەوە، دەبیــنم مێــردەکەمە. دەســتم گێڕا، چاوم گێڕا لە تەنیشتم نەما بوو. هەوە چۆتە نــاو کتێــبەکە لە نێــوان ئــایەت و ئەدیســۆن بــۆتە ئەســتێرە. تیشــکی زۆر بەهێــز بــوو. ئــاوی لە چــاوم هێنا. هەرگیز چ پیــاوێکم نەدیتبــوو وا بدرەوشــێتەوە. پێدەچێ هاوارم کردبێ، لە نــاو دێرەکان هاتە دەرێ و لە تەنیشتم راکشایەوە و گوتی:

هاتمەوە.

گوتم:

تۆش بوویتە ئەستێرە.

گوتی:

نا، پێکەوە دەبینە ئەستێرە.

هەوکەش ناوە سەر لە لاپەڕەی ئەستێرە دەدەمەوە. شتێک لە درەوشانەوەی ئەو شەوە دەبینمەوە. من و ئەستێرەدار پێکەوە کتێبەکەمان خوێندەوە. ئەو کتێبە نیشانەی پرسیار و سەرسوڕمانی لە سەر هەموو پیرۆزیەکان دانا. پێشتر بێ دەسنوێژ لە سەرت دابام، دەستم نەدەگەیاندە قورئانەکەی بابم. بەڵام دوای خوێندنەوەی کتێبەکە و بە ئەستێرەبوونی ئەستێرەدار و بزربوونی و پێداهەڵگوتنی بابم بەو کتێبەدا، چ پیرۆزیەک لە کن من نەما. بابم کە مەلایەتی لە بابیەوە بۆ هاتبوو، بابەلباب مەلا بوون، دوایوەی ئەستێرەدار کتێبەکەی بۆ برد و خوێندیەوە گوتی:

پێویستە هەموو ماڵێک ئەو کتێبەی تێدا بێت.

بیرمە بابم لە دەمی نانخواردنێ کتێبەکەی لە سەر چۆکی دانابوو، گوتی:

کەم کتێب هەیە درۆی زلی تێدا نەبێت. سوێند بەو زادە، ئەو کتێبە هێندەی سەرەدەرزیەک درۆی تێدا نیە.

دوایوەی ئەمن ئەستێرەدار و کتێبەکەیان برد، من دانەیەکیترم لە کتێبەکە کڕی. لە بەرگم گرت. ئەو پەڕی کلکی کۆترەش کە ئەستێرەدار لە دەمی خوێندنەوە دەیخستە کەلێنی پەڕەکانەوە، خستمە لاپەڕەی ئەدیسۆن و نوورەکە. بەڵام چەندی کردم بۆنی دەست و هەناسەی ئەستێرەداری نەگرت. من هەوکەش بە دوای ئەو دانەیەی کتێبەکەدا دەگەڕێم کە ئەمنەکە بە بەرچاومەوە بردی.

+ کوشتنی پیاوی ناو ئایەتان، یان ئێوە گۆتەنی کتێبنووس، بە هۆی کتێبەکە بوو؟

– نازانم، لەگینە پێوەندی بە ئامێرەکەوە هەبوو بێت.

+ ئەو ئامێرەی...

ئا، لە ئەستێرەدارم بیست، سوێندی دام کەس لە زارم نەبیستێ، تەماشای وێنەی پیاوی ناو ئایەتانی دەکرد و قسەی بۆ من دەکرد:

لە سایەی تۆوە دەبینە خاوەن ئەو ئامێرەی هەرکاتێ بمانەوێ وێنەی سەرۆک لنگاوقووچ بڕوات، دەنگی سەرۆک غژەغژی تێکەوێت و کەس تێینەگات.

هێندەی گوت و تەواو.

ژنــی ئەســتێرەدار دەگریــێ، بە کــوڵ دەگریــێ. فرمێســکی درشــت بە ســەر رووومەتیــدا رێچــکە دەبەستن. دەست دەبەم بۆی بسڕمەوە، خۆم دەگرم و دەســت دەکێشــمەوە. ســەردادەخەم، پاش کەمێک ســەرهەڵدەبڕم تنــۆکە فرمێســکێ لە کەلێنــی نێــوان لــــووت و رووومەتـــــی دەدرەوشــــێتەوە. دەبێــــتە ئەســتێرەیەک بە قەد کەلاشووشــە، گەورەتر دەبێت، دەموچــاوی دادەگرێت، گەورەتــر، ژنــی ئەســتێرەدار بەو رۆژە رووناکە، لە بن ئەو ســێبەری درەختە، بە بەرچـــــاومەوە دەبێـــــتە ئەســـــتێرە. دەمویســــــت دوورکەومەوە، ئەو هەستا و رۆیشت و گوتی:

مالآوا، ئەورۆ هێندە و بەس.

رۆیشت، بە ئەستێرەیی رۆیشت. چاوم لێیە بە بن ســێبەری درەختەکانــدا پێــی هەڵێنــا. تیشــک تیشــک تیشکی دەهاویشت. کوکوختیەکان دەستیان بە ککوو کــوو کــرد. گەلاکــان رەنگــی تیشــکی رەنگاورەنگیــان گرت. شوێن پێیەکانی هەستمکرد کاکێشــانە و منیــان بەگەڵ خــۆ دا. دەســـتەکە نەبــا، مــن رۆیشـــتبووم. ئاسمان و ئاسمان رۆیشتبووم. ئەبوو نەجم نــازانم

لە کوێ پەیدابوو، منی هێنایەوە بن درەختەکە و بەرەو ماڵێ گەڕاینەوە.

## ١٨

له بـارەی وەرگێڕانـی کتێـبەکەوە قسـە دەکەیـن. دەڵـێن باسـی گـورگ بکەیـت، دەردەکەوێـت. دیـارە وایە، ئەوەتــا وەرگێــڕ لە تەلەڤزیــۆن دەرکەوت. لە تەنیشت پیاوێک دانیشتووە، بە یەک ئاماژە شـار بە سەر شاردا دەدات. ئەبوو نەجم ناسیەوە و گوتی:

ئەها، ئەو پیاوە کتێبەکەی بۆمان کردە عەرەبی.

+ ئەو پەرلەمانتارە؟

- بەڵــێ، مــن لەوێ بــووم کــاتێ دایەوە دەســتی ئەبوو عەلا و مستەک پارەی وەرگرت و دەست لە سەر سینگ دوو سێ شەقاو پشتاوپشت کشایەوە و ڕۆیشت.

چــاوم بەو کتێــبەدا خشــاند. جــێ جــێ چەنــد لاپەڕەیەکم خوێندەوە. بـایی هێنده کە بزانم لە چی دەدوێ. دەڵێن ئەو کتێبە بە کوشتی دا، بەڵام پێناچێ وا بێ. کێشەی ئەو زۆر ئاڵۆزکاوە، پڕ نهێنیە. ئەگەر پیری پەنهانزان، دەنا کێ نهێنیی پیاوی نـاو ئایەتـان

دەزانی. هەر من نا، پێناچێ ئەبوو عەلاش شتێکی وای لێ زانیبێ. ئەویش فەرمانی بەغدای بەجێدەهێنا. پێش کوشتنەکەی یەک دوو جارێ لێمپرسی، سەری بادەدا و دەیگۆت:

زۆر ئاڵۆزکاوە، سەرەدەری لێدەرناکەم.

لەگینە کتێبەکە کەمێک کوشتنی پێشخستبێ. ئەو پیاوە دەبوو بکوژرێ، بۆ؟ تێینەگەیشتم، تۆ بڵێی بە هۆی ئەو ئامێرەوە بێ کە تۆ باسی دەکەیت؟ نازانم. من بەو ئامێرەم نەزانی بوو، یان ئەوەی کتێبێکی بە دەستەوەیە ئەگەر بڵاوبێتەوە شار هەڵدەگێڕێتەوە، نازانم. لا بە لا قسەیەکی وام بەر گوێ کەوت، بەڵام بە هەندم هەڵنەگرت، یان ئەوەی لە دووکانەکەیەوە گێرەشێوێنی بڵاودەکاتەوە، نازانم. من هێندە لێی نزیک بووم و زوو زوو سەردانم دەکرد، هەستم بە هیچ نەکرد. ئەو پیاوەم هێندەی پیری پەنهانزان، لەویشم خۆشتردەویست.

شتێکم بیرکەوتەوە، ئەو شەوەی پیری پەنهانزانمان هەڵدایەوە ئەو سەرە کۆڵانەی لێیەوە هەڵمانگرتبوو، وەک ئەوەی لە بنی بیرەوە قسەبکات، رستەکانی پچڕ پچڕ بوون، هێندەم لێهەڵهێنجا:

نەیانهێشت پیاوی ناو ئایەتان لە ناو کارێزەوە هەڵبێت و...

لە سەر ئەو قسەیە، لە دەستم نەبوو، دەنا دەمگێڕایەوە زیندانێ.

ئەبوو نەجم خەوەنووتکەی دەبردەوە، سەری بە تەنیشت پێکەکەی کرد و پرخەی هات. لە نەوارەکە گوێت لە پرخەکەی دەبێت. جغارەکەی لە دەست کەوت. تا جغارەکەم هەڵگرتەوە و تەپڵەکەم خاوێنکردەوە، ئەبوو نەجم وەک ئەوەی ئاویان پێداکردبێت، راپەڕی و چاوی بە هۆدەکەدا گێڕا و گوتی:

+ نەمردووە، دێتەوە.

- کێ؟

+ پیری پەنهانزان.

- وای لەو خەونە!

+ یەک خەونی ناو سەرخۆشیم نیە، نەهاتبێتەدی.

لەو جێیەی بە زیندوویێتی هەڵمانگرت و بە نیوە مردوویی فڕێماندا، لەوێ لە ناو تاریکی

راوەستابووم. لەهیکرا ڕووناکبوومەوە، وا تێگەیشتم گلۆپی دارتێلەکە داگیرسا. سەرمهەڵبڕی ئەستێرەیە، نەرم نەرم دادەبەزی، بەر لەوەی من بیناسمەوە ئەو منی ناسیەوە و گوتی:

لەو ڕۆژانە دەگەڕێمەوە.

ئەوەشی گوت:

گەردنت...

تەواوی نەکرد، بەئاگاهاتم، تۆ بڵێی (ئازاد)ی گوتبێت، یان مار پێوەیدات!

+ ئەگەر هاتەوە! پێیدەڵێم با (ئازاد)ەکە بڵێ!

- گاڵتە بکە، هەر دیتت ئەستێرەی ئاوابوو، هەڵهاتەوە.

خەونەکە خەوی ئەبوو نەجمی ڕەواندەوە، من خەوم لێکەوت. ئەو تا شل بووبوو بە دەم خەوەوە قسەی کردبوو، هێندەی ڕێسابوو، نەوارەکەش نەیگرتبوو:

پیری پەنهانزان دێتەوە، خۆمی پێدەناسێنم، دەڵێم من بووم زمانم لێدای، من بووم بە زەبری قامچی

بە قسەم هێنای. من بووم هاتم لە گۆڕت دەربێنم، بە هەڵە تەرمی ئەستێرە ژنەکەم برد و لەو ئاقارە خستمە بن خۆڵەوە و ئێستا بە جێیەکەی ناکەومەوە. ئا من بووم، ژنی ئەو پیاوەم گۆڕبزر کرد، ئەو پیاوەی وا قسەی بۆ دەکەم و خەوتووە. ئەو پیاوەی ناوی سێزدەی هەڵگرتووە، بەڵام من حەزدەکەم بە سەرهاتنووس ناوی بێنم. من بووم، پیری پەنهانزان ئەوە من بووم، وێنەیەکی تازەی پیاوی ناو ئایەتانم گەیاندە دەستی ئەبوو عەلا.

من بووم ئەو هەموو نەوارەم پێت پڕکردەوە. من بووم، نەتناسیمەوە دەنگ و رەنگی خۆم گۆڕی بوو. من لەگینە گومان لە خۆم بکەم، تۆ چۆن باوەڕدەکەیت. نا، ئەگەر دڵت نەیتریواندبێ، باوەڕناکەم باوەڕ بە قسەکانم بکەیت.

لەو دەمەی ئەبوو نەجم بۆ منی خەوتوو قسەدەکات، منیش خەونێک دەبینم. خەون بە ئەستێرەکەی خۆمەوە، لەو خەونە من و پیری پەنهانزان لە سەر بانێ روو بەڕوو دانیشتبووین. لە قادرمەکەوە کەسێک سەردەکەوت، بە دەنگی پێی ناسیمەوە، هەو بوو، هات کتێبێکی بە دەستەوە بوو، بۆی راگرتین و گوتی:

ها، ئەوە پیاوی ناو ئایەتانە.

ویستم لێی وەرگرم بزربوو. گوێم لە دەنگی بوو، هێندەی تێگەیشتم:

چیدی لە زەوی بۆم مەگەڕێن، من لە ئاسمانم.

لە دەنگی وی بەئاگاهاتم، دوای لێدانەوەی دەنگی ئەبوو نەجم خەونەکەم بۆی گێڕایەوە، ئەویش ئەوهای بۆم لێکدایەوە:

گیانی لە ئاسمانە، گۆڕەکەی لە زەویە و دەیبینینەوە، تۆ نازم غەزالیەکەی بخە سەری.

ئەبوو نەجم ماوەیەکە بێ غەزالی زاری تێکدەئاڵێ و قسەی بۆ نایێ، دەڵێ:

ئێستا تێدەگەم پیری پەنهانزان بۆچی داوای لاوکی دەکرد.

## ١٩

لێره سالانێک پێکەوه بووین، بەلام هێندەی ئەو دانیشتنه کورتەی سەر زێی نیل نەمناسی. لەوێ زانیم له دەو زێ له تەک زێیەک دانیشتووم. ئەو پیاوه له قسه نیل بوو. زێ چکی کردبا، ئەو فەرموودەی لێنەدەبڕا. من درەنگتر ناوم له گوتەکانی وی نا فەرمووده. هەرچەنده مامۆستاکەی برادەری فەرموودەی له دڵ خۆش نەبوو. به پێکەنینەوه پێیگوتم:

کوفران مەکە، قسەکانی وی فەرمووده نین، ئایەتن.

پیاوی سەر نیلێ، خەڵک گۆتەنی پیاوی ناو ئایەتان پاشتر دەیگۆ:

چ جێ وەک ولاتی فیرعەونان، وەک ناو ئەهرامان، وەک کەناری نیل بۆ تێگەیشتن له ئایین، له ئایەت و فەرموودان لەبار نیه. حەیف، من لەوێ کەم مامەوه، دەنا له فیرعەونان جوانتر تێدەگەیشتم.

وڵاتی من تەنێ کڕنووش و پاڕانەوە دەزانـێ، دەچلە و فرەهـات لە ملکەچـیەوە سـەرچاوە دەگـرن، بەڵام نیل نا، نیل لە یاخیبوونەوە دێ.

پیاوی ناو ئایەتان کە من نـاوم نـا ئەسـتێرەی نـاو نیلێ، پاشـتر ئەستێرەیتریشـی بەسـەردا بـڕا. هەر بە راستی ئەستێرە بوو. ئەستێرەیەک لە خڕ ئەسـتێران پرشـنگدارتر. ئەسـتێرەیەک لە سـەر زەوی و لەبەر دەسـت، دەتـوانی دەسـتی لێبـدەیت، دەتـوانی لە تاریکایی پێشی خۆتی بدەیت. هەر جارێ لە تاریکیی نـاو کتێبـان بزردەبـووم، ئەو چەنـد تیشـکێکی خـۆی دەنـارد و بەر هـزرم دەبـووە چراخـان. بەر لەوەی بـگەمە وڵاتـی فیرعەونـان و لە سـەر نیـل بیبیـنم، کەوتبـوومە کـۆڵانە تەنـگ و تاریکەکـانی مامۆسـتا شـافیعی. ئەو تیشـکی نـارد و بەر پێمـی رووناککردەوە. جـارەکی لە بـن تیشـکی وی لێمپرسی:

ئایینی ئێمە کەوتـۆتە زۆنگاوێ، نـاکرێ بیخەینە نیلەوە، جوولەی تێبخەینەوە، نوێی بکەینەوە؟

بە زمـان نـا، بەو تیشکانەی لە چاویەوە هـاتن، لە سەر لمەکە بە هێلی تیشک نووسی:

ئایین کۆن و نوێی نیە.

لە دیدارەکەی نیلیَ، بە بەر چاوی خۆمەوە خۆی بە نیل دادا و لە بن ئاویَ دەتگوت گەلاوێژە دەدرەوشایەوە. کاتیَ هاتە دەریَ، تیشکی تەڕی لێوە دەچۆڕایەوە. شان بە شان سەردانی ئەهرامەمان کرد. ئەوَ ئەستێرە بزێوە دەیویست لەگەڵ من لە ئەزهەر بمێنێتەوە، نەمایەوە. لە باڵیدا و گەڕایەوە ئاسمانی قەلاتیَ. بەڵام لەوێشەوە تیشکی ئەوم دەدیت.

من درەنگ هاتمەوە. درەنگتریش دیتمەوە. رۆژێکی هەوراوی لە ناو ئەو ئەشکەفتە تاریکەی بە ئەشکەفتی دەنگ دەچێتە ناو جوگرافیا و دیرۆکەوە، دیتمەوە. لەویَ درەوشانەوەی ئەو نەبا، چاو چاوی نەدەدی. هەر لە ڕێی ئەویشەوە دەنگی ئەشکەفت بە دنیادا بڵاوبۆوە. ئەوەشم لەبیرە شتێکی لیَ ئاڵۆزکابا و سەرە وایەرەکی دەنگی لیَ بزربا، ئەو پیاوە یارمەتی دەدا کە ئێستا دەزانم پیری پەنهانزان بووە.

+ تۆ پیری پەنهانزانت نەدەناسی؟

– چەند جارێکم دیتووە، بەڵام هەرگیز ئەستێرەییم تێدا نەدیتبوو. چ بزانم...

دیرۆکنووسی جوگرافیاناس پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت. دەستی خۆی دەشکێنێتەوە. چۆن لە بن دەستی خۆی بووە و نەیناسیوە. دیرۆکنووس دەڵێتە من:

ئەو ئەبوو نەجمەت لە کوێ دیتەوە؟ ئەگەر ئەو سەربردانەی دەیگێڕێتەوە، لە زاری پیری پەنهانزانەوە بن و بۆی هەڵنەبەستبن، کتێبی (دیرۆکی ئەستێرەکانی قەڵاتێ) رووناکی نابینێت. نابێت بکەوێتە بەر دیدان، دەبێت سەر لەنەوێ بینووسمەوە. لە دیرۆکی کوڕەکەی غەزالی چاو ئەستێرەوە بۆ لاوکبێژ و کوڕی عەبابەیلێ و دوا داودەکە. لەوانەوە بۆ کوڕە ئاڵا و سەرگەردانی خەندەی بایی و مەلاکە و کچە فەلە تا دەگاتەوە پیاوی ناو ئایەتان، هەموویان بێ سەربردەی پیری پەنهانزان کرچوکاڵن.

جوگرافیاناس دەڵێ:

من وا لە سۆراخی کونی بن زەویی ناو خەونی پیری پەنهانزانم. ئەگەر گەیشتمە کونێکی وا، شار دەبێتە خاوەن جوگرافیا و دیرۆکێکی وا، کەس لە خەونیش نەیخوێندۆتەوە و نەیدیتووە.

دیرۆکنووسی جوگرافیاناس:

من بە دوای نەوارەکاندا دەچمە ئەمریکا. لە ناو داخراوترین چاوەی هەواڵگرییش بێت. دەبێت بە دوایاندا بچین.

هەستا. لە سەر دەرگا ئاوڕیدایەوە و گوتی:

چۆن لیمۆ دەگوشی، ئەبوو نەجم وا بگوشە، دوا وشەی لێ داچۆڕێنە.

## ٢٠

کاتێ گەیشتمە سەری، گیانی تێدا مابوو. تەقەکەران بە بەر چاومەوە قووچاندیان. دەستم خستە سەر دڵی، وەک من هەناسەی دەدا. دەستم خستە بن شانی، خوێنی گەرم وەک قسەکانی گەرم لە کەلێنی پەنجەکانمەوە چوڕاوگەیان بەست. لە ناو چۆڕاوگەی خوێنێ وردە ئەستێرەی بە قەد زەنگیانەم دیت، بە سەماوە بەرەو سەر شۆستەکە ڕێچکەیان بەست. لە چاوە نیوە کراوەکانی تیشکم دیت، لە دیوارەکەیان دەدا و هەڵدەکشان بەرەو ئاسمان و بزر دەبوون. پێدەچوو منی ناسیبێتەوە، وەستام بوو. شاگردێکی زیرەکی وی بووم، لەوەوە فێربووم کە لە پارچە تەنەکەیەک و پاتریەک و سێ چوار وایەرێک...و دەنگ و دەنگدانەوە بێنمە بوون. ئا، ناسیمیەوە، ئەو دوو پەنجەیەی پێنووسی پێدەگرت، بۆ بەرکی چەپی چاکەتەکەی درێژکردن و بە دەنگێکی پڕ لرخ لرخ گوتی:

کاخەزەکە هەڵگرە.

دەستم بە باخەڵیدا کرد، پەڕەکاخەزێکی گەورەی چەند جار نووشتاوەم دەرهێنا و خستمە گیرفانمەوە. خەڵک خڕبوونەوە، منداڵان بە کتێبەوە بە سەر دیواری قوتابخانەوە بازیان دا و دەوریان دا، بەر لەوەی بیخەینە ناو ترومبێل، گوتی:

پێیانبڵێ، مەلا لە سەرم نەخوێنێ.

ئەوە دوا قسەی وی بوو. چەندی هەوڵمدا شتێک بڵێ، زمانی شکا، چیدی نەگوت. لە خەستەخانە دەهاتمە دەرێ، پەڕە کاخەزم دەرهێنا بیخوێنمەوە، لێکمنەکردبۆوە، کاخەز درەوشایەوە. لەو ساتە قۆڵم کەوتە ناو دەستێکی ئاسنینەوە. فیلەتەنێ بوو لەو گۆڕە. کاخەزەکەی لێوەرگرتم. بە زللە و شاپێک هەڵیدامە سەر جادە.

+ راسپاردەکەت بەجێهێنا؟

- نا...

+ لۆ؟

- ویستم بە کەسوکاری بڵێم، نەوێرام.

+ لە چی ترسای؟

- تۆ ئەو خەڵکە دەناسی، لە خۆیان ترسام، بڵێم گوتوویەتی: قورئانم لە سەر مەخوێنن؟ باوەڕیان نەدەکرد و بە شێتیان دادەنام.

+ راستە، نەمبیستووە کەس هەبووبێ، لە سەرەمەرگی گوتبێتی: پرسەم بۆ دامەنێن، قورئانم بۆ مەخوێنن.

- لەو شارە هەر کەسێ شتی وا بڵێ، کەسوکاری چەند قورئانخوێنێکی بۆ دەگرن، بۆوەی گوناهی سووکتر بێت.

+ خەتێکیشت لە کاخەزەکەی نەخوێندەوە؟

- نا، هیچ

+ تا گەیشتنە خەستەخانە مابوو؟

- ئا، هەناسەی دەدا، هەناسەی تیشکاوی.

+ چۆن تیشکاوی؟

- وەک چۆن رەژووی داگیرساو باوەشێن دەکەیت، وابوو. لە هەناسەیەوە هەستم دەکرد پرووشکەی ئاگر بڵاو دەبێتەوە.

+ هەناسەی گەرم؟

- نا، پرووشکە ئاگری دەوی وی، فێنک بوون، لە بای باوەشێنەی بن کەپرێ فێنکتر.

+ ئەمنەکە کووی زانی، کاخەزەکەی دەستی تۆ هی ئەوە؟

- نازانم، دوور نیە کەسێک لەوانەی لەوێ لە بن دیوارەکە لە سەری بوون، زمانیان دابێت.

+ ئەها، باشە تۆ بۆچی بەجێتهێشت و لای نەمایتەوە؟

- دەریانکردین، نەیانهێشت کەس لە کنی بمێنێتەوە. پێموایە چارەسەریان کردبا، نەدەمرد.

+ ئەمنەکەت نەناسیەوە؟ نەتبینیەوە؟

- ناسیمەوە، چەند جارێ لە نوێژی هەینی دیتبووم.

+ نوێژی دەکرد؟

- لە ریزی نوێژکەران نوێژی دادەبەست.

+ پاشتر تووشی نەبوویەوە؟

- نا، تا سێ چوار ڕۆژ دوای ڕۆژی هەستانەوەی گەورە.

+ ئێ؟

- ئەوە بوو لە کۆلانی ماڵی ئەو مەلایەی فەتوای رژانی پیاوی ناو ئایەتانی دا و لە هەموو مەلایان ڕشتتر بوو لە سەر ڕژانی.

+ پێڕانەگەیشتی پرسیاری کاخەزەکەی لێبکەیت؟

- ڕاستی تا لە خوێنیان وەرنەدا، کاخەزەکم بیرنەکەوتەوە. چوومە سەری، سەرم بڵندکرد، لرخەلرخی بوو، دەمویست پرسیاری کاخەزەکەی لێبکەم، دوا هەناسەی دا.

+ لە خوێنی ئەو هیچت نەدی؟!

- نا، خوێن و هیچ.

+ تۆ بە ڕاست لە ناو خوێنی پیاوی ناو ئایەتان وردە ئەستێرانت دی؟

- درۆ ناکەم، لە خوێنەکەیەوە وردە ئەستێرە ڕژانە سەر شۆستەکە، لەوێوە لە باڵیان دا و ستوونی سەرەو ئاسمان هەڵکشان.

سێ چوار جارێ چوومە تاقیگەکەی، کەم کەس ئەو جێیەیان دیتووە، ئاخر دەبوو هونەری ئەستێرەت زانیبا و جێ متمانەش بی، ئەو دوو مەرجە لە کەم کەس هەبوو.

+ هونەری ئەستێرە؟!

شاگردەکەی پیاوی ناو ئایەتان، ئەوها هونەری ئەستێرە پیشاندەداتەوە:

تاقیگە کچگەیە، جێی حەفت کورسی لێنابێتەوە، لێ پڕە لە ئەستێرە. وەستام بە ئاسمانی تاقیگەوە هەر سەرە وایەرێک گلۆپێکی گچکە لە شێوەی ئەستێرەی پێوەکردووە. بە دوگمەیەک ئەویش لە شێوەی ئەستێرەیە دایاندەگیرسێنێ. بەڵام بەر لە داگیرساندنی ئەستێرەکان خۆی دادەگیرسێ. رووخساری دادەگیرسێ. لە خڕ ئەستێرەکان درەوشاوەترە لە شێوەی مانگە، جۆخینەی بەستووە، تاقیگەی وەستای من مانگەشەو بوو.

هەر کاتێ سەرم بە دەرگای تاقیگەدا دادەگرت، تەونی جاڵجاڵۆکەم دەدیت. وام هەستدەکرد ئەشکەفتی حەڕام هاتۆتە خەونێ. ئەو هەموو وایەرە تێکئاڵۆزکاوە، کەس سەرەدەری لێدەرنەدەکرد.

کەچی وەستام یەک یەک دەیناسینەوە، سەرە وایەری دەدیتنەوە، دەیزانی دەگاتەوە کوێ و کام ئەستێرە هەڵدەکات و دەیکوژێنێتەوە.

رۆژێک تەختە دارێکی کچە لە ناولەپ شتێک گەورەتر، ئەستووریشی پەنجەیەک شتێک ئەستوورتر، لە تەنیشتیەوە وایەرێکی وەک داوەدەزی بارێک هاتبووە دەرێ و گەیشتبۆوە ئەستێرەیەکی حەفت تیشک، گوتی:

جگە لە خۆت کەس بەوە نەزانێ، بیبە ماڵێ، ئەوشۆ زوو زوو تەماشای بکە بزانە دادەگیرسێ یان نا، سبەی زوو هەواڵەکەم بۆ بێنە.

ئەوەبوو لە سەرە کۆڵانی ماڵێ، ئیستۆپێک دنیای لەرزاند و دوو قات زەیتوونی هەڵیاندامە ناو ترومبێل، بەرکیان پشکنیم و هەندێ پەرەکاخەز و تەختەدارەکەیان لە گیرفانی ساقۆکەم دەرهێنا. لەو ساتەی دەیانویست دەستوچاوم ببەستنەوە، کەوتینە بەر رێژنەی گوللە. دارتێلێک ترومبێلی گرتەوە و من دەرپەڕیم و ئاوڕمنەدایەوە. نەمزانی چی روویدا و تەختە دارەکەی وەستام گەیشتە دەستی کێ.

دەمویست ئەو شەوە هەواڵەکە بگەینمە وەستا، نەوێرام. نەچوومەوە ماڵێش، لەوێش زگچوونێکم تووش هات، تا سبەینێ لە ڕێی ئاودەستێ بووم. سبەی زوو چوومەوە کن وەستام. لە ڕۆژان درەوشاوەتر دیاربوو. بەر لەوەی زار هەڵبێنم گوتی:

گلۆپەکە هەڵبوو؟

کاتێ سەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، داما، زۆر داما، گوتی:

هەواڵێکی خراپ بوو، نەمبیننەوە باشە.

+ ئەو ڕووداوە پێش کتێب و فەتوا بوو؟

- نازانم کتێبەکە، بەڵام فەتوا نەدرابوو.

+ گرتنەکەت بە هۆی تەختەدارەکەوە بوو؟

- باوەڕناکەم پێوەندی بەوەوە هەبووبێت، نازانم.

+ ئەدی کوشتنی وی، تۆ بڵێی...

- نازانم، بەڵام دوور نییە ئەستێرەکان وەستاکەمیان بە کوشت دابێت. ئەو ئەستێرانەی لە تاقیگەکەی مانگەشەویان بە دەوریەوە

درووستکردبوو. ئەو تاقیگەیەی لە سەر دەرگاوە لە ئەشکەفتی حەڕا دەچوو.

+ بە قسەی تۆ بێت، کتێب بە کوشتی نەدا؟

- نا، وایەر، وایەر، وەستای من وایەر بە کوشتی دا، وەستام ئێوە گۆتەنی پیاوی ناو ئایەتان، وایەر کوژاندیەوە.

شاگردەکە بە قورگی پڕ گریانەوە باسی وەستاکەی دەکات. ئاخان هەڵدەکێشێ کە لە نیوەی رێ بەجێیهێشتووە. شاگردەکە لە چۆکی خۆی دەدات و دەڵێ:

ئای ئەگەر ئەمنێکی گەورەی هەینێتم دەستدەکەوێ، چۆن بە دوو پارچە وایەر پاتریەکی گەورە بە قسەی دەهێنم و کوشتنی وەستاکەم ئاشکرا دەکات.

شاگرد نازانێ ئەبوو نەجم لە بن دەستی خۆمانە.

## ٢١

وایە، لەو جێ و دەمەی ئەو دەیڵێ رووداوێکی وا روویدا، ئەبوو عەلا دەستبەجێ هەواڵی دامێ کە (موخەرییبین) لە نزیک منارە دەستیان لە(ریفاق) وەشاندووە. بەڵام شتێک لە بارەی تەختەدارەکەوە نازانم، نە دیتوومە نە باسیان کردووە.

+ بەڵام شاگردەکە دەڵێ: دوو وایەری لە گوێ بێخم، تەختەدارەکە دەبینێتەوە!

- منارەش لە گونم بێخێ، شتێ لە تەختەداری دەستناکەوێ.

دوورنیە، تەختەدارەکە گەیشتبێتە (ئەمن) لێ من لێی بێ ئاگام. دەزگای ئەمن ئاڵۆزە، شت هەیە لە بن سەرت روودەدا، ناتگاتێ. ئەبوو عەلا بە بەرچاومەوە دەمانچەی لە نێوچەوانی پیاوێک بەتاڵکردووە، نەمزانیوە کێیە و بۆ؟ بۆم نەبووە پرسیاریش بکەم. ئەبوو عەلاش زۆر شت هەیە

کردوویەتی و نەیزانیوە بۆ، پێکهاتەی ئەو دەزگایە ئەوهایە.

پیاوی ناو ئایەتان کێشەیە، ئاڵۆزە. وەک گوتم ئەبوو عەلاش سەرەدەری لێدەرنەدەکرد. من نازانم وشە بە کوشتی دا یان وایەر. ئەوەی لە بارەی ئەو پیاوەوە دەیزانم لە پیری پەنهانزانەوەیە. لە ڕێی ئەویشەوە پێکەوتم کوژانەوەی ئەو ئەستێرەیە تاریکیەک بە دوای خۆیدا دەهێنێ، شار تاریکایی وای بە خۆوە نەدیوە. بیرمە لە خەوێ دەیگۆت:

پاش تۆ شار پاشەوپاش دەکشێتەوە، دەگاتەوە سەردەمی ئۆسمانی، تاریک تاریک، ئەستێرەیەک بە ئاسمانیەوە نامێنێ.

ئەبوو نەجم دەنگی دایە نازم غەزالی. نیو پێکەکەی کردە فڕێک و کووزە لیمۆیەکی مژی و گوتی:

لە بارەی ئەستێرەکانەوە هەر هێندە دەزانم کە لە پیری پەنهانزانەوە بیستوومن. شەو و ڕۆژ وەک لیمۆ مێشکی خۆم دەگوشم قسەیەکی ئەوم بیربکەوێتەوە. ئەو هەموو عەرەقە دەخۆمەوە هەر بۆ ئەوەیە قسەی ئەوم بیربکەوێتەوە. نەوارەکان

ببینـنەوە، مـن لە کـۆڵ گێـڕانەوە بـکەنەوە. پیـری پەنهانزان بە من ناگێڕدرێتەوە. کاتم کەمە با بەشی دیتنەوەی ئەستێرەکەی بن خۆڵی بکات. نەیبینمەوە لە ناو گۆڕیش کەڵەکەم ناکەوێتە عەردێ.

+ تۆ بکوژەکانی پیاوی ناو ئایەتانت نەهاتەوەبیر؟

– وەک گوتم هەینێش نەمزانی کێ و کێن، ئەبوو عەلا دیاریکردبوون.

ئەها، زەنگی دەرگایە، دەنگەکە کزە، رەنگە لە نەوارەکە دەرنەچێ.

***

شاگردەکە بەرانبەر ئەبوو نەجم دانیشتووە. تاوێ لێـی رادەمێنـێ. تـاوێ پەنـجەی بیرکـردنەوە لە روومەتی دەچەقێنێ و دیار نیە چاوی لە چی بڕیوە. هەبـێ نەبـێ ئەو پیـاوە دەناسـێت، بەڵام بیریناکەوێتەوە کێیە و لە کوێ دیویەتی. پاش یەک دوو پێک، روو لە ئەبوو نەجم:

وێنات دەکەم، نایتەوە بیرم.

ئەبوو نەجم لەسەرەخۆ:

سمێڵم بێتەوە، رەنگە بیرتبکەوێتەوە، بەڵام من تۆ ناناسم.

پاش بەینێک دەست دەخاتە سەر شانی و دەڵێ:

هەڵە نەبم، تۆم لای وەستام دیتووە، برادەری ئەو نەبووی؟!

ئەبوو نەجم دادەمێنێ، هەستدەکەم دەیەوێ خۆی ئاشکرا بکات. بە چاو پێیدەڵێم شتی وا نەکەیت، بە قسەم دەکات و دەڵێ:

وایە، من برادەری وی بووم.

شاگردی وەستا هەڵدەستێ و دەستی لە مل دەکات و بەر ماچانی دەدات:

وەستام تۆی زۆر خۆشدەویست.

ئەبوو نەجم گریا، جوان گریا، لە دڵەوە گریا، ژنانە گریا. پیلم گرت و بردمە لای دەستشۆرەکە. سوورە لە سەر ئەوەی خۆی ئاشکرابکات. تکای دنیام لێکرد تا پەژیوانم کردەوە:

+ تۆ ئەو کورە ناناسی، بزانێ دەستی تۆشی تێدایە دەتکوژێت، ناگەینە چیرۆکی ئەستێرەکان.

- باشە، لەبەر خاتری ئەستێرەکەی تۆ و پیری پەنهانزان، بە قسەت دەکەم.

شاگردی وەستا دێ و دەست لە ملی ئەبوو نەجم دەکات و دەڵێ:

+ بمبوورە برینم کولاندیەوە. وەستای من وابوو، هەر کەسێ جارێ دوو لەگەڵی دانیشتبێ، چووەتە دڵی و بیریناچێتەوە.

- وایە، بە تایبەتی من، ئاخر دەزانی...

پێدەچوو بن بەرە بهێنێتە سەر بەرە. دەستم برد قونجڕکەیەکی لێدەم، لەو ساتە زرمەیەک، وەک قەلات تەقیبێتەوە وابوو. جامی پەنجەرە هاتنە خوارێ. بوتلەکە کە لە سەر لێواری مێزەکە بوو، کەوتە عەرد و عەرەق رژا و کارەبا کوژایەوە. ئەبوو نەجم دەڵێ:

ئەوە تۆپی بەعسە، نەگەیشتبێتەوە شار؟

شاگرد دەڵێ:

نا، ناوەخۆیە، وا تێبگەم تۆپی یەکەمی شەڕی براکانە.

قسەی شاگرد دەرچوو.

دەنگی دەرگایە، بە مەستی و بە ناو تاریکی و بە سەر وردە شووشەدا چووم:

کێیە؟

بە تووڕەییەوە:

بیکەوە.

کردمەوە، لایتی لە ناو چاوم راگرت:

+ کوا ئەو بەعسیە خوێڕیە؟

- بەعسیی چی!

+ با ناو دەمت پڕ نەکەم لە گوللە، ئێواریّ بە چاوی خۆم دیم هاتە ئێرە.

چوار پێنجی بە ژۆریّ کەوتن، لەو ساتە کارەبا هاتەوە. پیلی شاگردیان گرت:

خوێڕی، بەعسی، رادیۆ بۆ حیزبی خایەن چاکدەکەیتەوە، بۆ ئێمەی چاکناکەیتەوە؟

شاگرد گوتی:

هەرچی بم بەعسی نیم، خۆتان بەعسین.

دایانە بەر شەق و قۆنداخە تفەنگان و بردیان و ئێمەش هیچمان لە دەست نەهات. ئەبوو نەجم گوتی:

تەڕ بەعسیان ناسیەوە!

لە ناو تەقوهۆڕی ئەو شەوە، دەسرپێژێک رایچڵەکاندم. چەند جارێ هاتمە دەرێ و تا ئەو سەر و ئەو سەری کۆڵانێ دەچووم. گیزەی گوللە لە ژۆرێی دەکردمەوە. نەخەوتم، ئەو شەوە نەخەوتم، بەیانی دابوو نەدابوو، لە کۆڵانێ سووڕامەوە دیوی قوتابخانەکە. لەو جێیەی کاتی خۆی وەستایان لە خوێنی خۆی گەوزاند، شاگرد لە خوێنی خۆی گەوزابوو.

گۆڕەکەشی کەوتە نزیک گۆڕی وەستاکەی. لە پرسەکەی دەهاتمەوە، پۆلیس گرتمیان. لە پۆلیسخانەوە بۆ دادگا، من دەستم لە کوشتنی شاگردەکە هەیە! دوو دیدڤانیش هەیە. دەڵێن، ئەو شەوەی کوژرا بە چاوی خۆمان دیومانە لەو ماڵە بووە، ئەو دیدڤانانە خراپیان بۆ تێکوشیم و بە

دەستچێنی بەعسیان دانام. پاشتر گواستمیانەوە زیندانەکەی پیری پەنهانزان.

من دیدڤانەکان دەناسمەوە، بکوژەکانن. ئەبوو نەجمیش دەیانناسێتەوە، بەڵام نەمهێشت ئەو تێکەڵ بێ. ئەو دەبێت دوور بێت لە کێشە و بەڵا، ئەو چیرۆکی ئەستێرەکان دەگێڕێتەوە. دێ، ئەبوو نەجم بە پارچە پاکەتەوە دێتە سەردانم، بە چرپە:

+ ئەها، لەو هۆدەیەی تەنیشتت، پیری پەنهانزان چیرۆکی خۆی دەگێڕایەوە، لەو هۆدێهی...

- وا دیارە چیرۆکەکە لە زیندانێ کۆتایی دێ.

+ وا مەڵێ، هەر دێتت بەربووی.

- تۆ ئاگاداری خۆت بە. چیت بیردێتەوە، تۆماری بکە. با بە دەردی ئەوانی دی نەچن.

کورە زیندانیەکەش هەر جارێ دێ، هەواڵی رووخانی لایەکی شار دەهێنێ. هەواڵی کوشتوبڕ، راونان، قاتوقڕی دەهێنێ. بەڵام پێکەنینێکی هەند خۆشی پێدادەکات، وەک ئەوەیە مزگێنیی ئازادیی پێبێ.

ژنی ئەستێرەدار سەرم لێ نابڕێ و پێیەکی لە زیندانییە. گوێ ناداتە تیروتوانج و سووکایەتی پاسەوانەکان. زوو زوو بە مەنجەڵێ دۆڵمەوە دێ. ئێستا بە خوێندنەوەی نامەی ناو سێوەکە خۆم ڕاگرتووە.

ئەو لە ئەستێرەوە بۆم هات. ئەو ڕۆژە ئەو ژنە چەند بە ئەستێرە دەچوو. لە هەر لایەکەوە بۆم دەڕوانی ئەستێرە بوو. دەنگیشی دەنگی وی بوو. ئەستێرەکەم دوای ئەو هەموو ساڵە لە گۆڕێ هاتە دەرێ و بە سێوێکی نامەدارەوە هاتە بەر شیشەی زیندانێ. نزیک بوو، هەر گەزێ لێم دووربوو. چەند حەزم دەکرد لە ئامێزی بگرم، نەگەیشتمێ. پاسەوان نەیهێشت دەستم بیگاتێ.

ئێستا بەو نامەوە دەژیم. خۆزی لە ساڵی یەکەمی زیندانێ دەینارد.

## ٢٢

له ژنی ئەستێرەدارەوە بۆ سێزدەی جوان

سڵاوی ئازادی

پێش ئازادی، ئەستێرەدار پێدەچێ لەو جێیەی تۆ، لە پشت ئەو شیشانەوە ئەستێرەکانی خەیاڵی خۆی ژماردبێ. ئەو رۆژە کە لەو دیو شیشەکانەوە تۆم دی، نازانم بۆ وا هەستمکرد بە دیار ئەستێرەدارەوە راوەستاوم. خۆ ئەوم لەوێ نەدیبوو، بەڵام نازانم بۆ تۆ بەو دەچووی، یان ئەو بە تۆ دەچوو. رەنگە لە زیندانێ لە پشت شیشەکانەوە مرۆڤەکان شێوەیان لە یەک بکات.

پیاوی زیندانی، زیندانیی دوای ئازادی، تۆ بە لەدەستدانی ئەستێرەکەت و من بە لە دەستدانی ئەستێرەدارەکەم چەندان جار مردین و زیندوو بووینەوە. تۆ بە دوای گۆڕەکەیدا وێڵی و من بە دوای هەواڵێکی، دڵم دەڵێ نەمردووە و ماوە، بەڵام دەزانم نایبینمەوە. کاتێ لەو دیوەی شیشەی

زینـدانێوە تەماشـای تـۆ دەکەم، چەنـد بەو دەچـی!
ئەرێ ئێوە لە چی خزم دەبنەوە؟

زیندان جێی تۆ نیە، دڵنیام زوو بەردەبی.

ژنێک چاوەڕێتە و پێویستی پێتە.

نامەکەم خستبووە ناو سێوێکەوە. کونێکی کچگەم تێکردبوو. بە مووکێش ناویم دەرهێنابوو. نامەکە پەڕەکاخەزێکی گچکە بوو. لوولمدابوو، خستبوومە ناوی. لە سەر سێوەکەش بە نینۆک نووسیبووم (تەنها خۆت)، نامە وا نەبێت ناگات. لە دەرگا بن نینۆکیش دەپشکنن. ئاخر پێش ئازادی و دوای ئازادی زیندان هەر زیندانە.

راستی، ریگەیەکیتریش هەبوو، بەڵام نازانم بۆ حەزمکرد لە ناو سێوێکدا بۆی بنێرم.

لە سەر دەرگا هێشتا پێیەکم لە دیوی زیندانێ بوو، ویستم بگەڕێمەوە، چەند هەوڵمدا پۆلیسەکە رێینەدا و گوتی:

کاتی دیدار تەواو.

له نـامەکەم پەژیوانبـوومەوە، بە تـایبەتی لە دوا رسـتە. بە درێژایـی ئەو شـەو و ڕۆژە لە خـودا پاڕاومەتەوە، سێوەکە بەر کەسێکی تر کەوتبێ و لە تامەزرۆیی بۆ سێو پەرە کاخەزەکەشی قووتدابێت و بەر چـاوی مێـردی ئەسـتێرەی دەسـتە خوشـکم نەکەوتبـێ. ئەرێ ئەو پەشـیمانیە چـیە وا پەنـجەم پێدەگەزێ!

***

سڵاو

لە کۆنە زیندانیەکەوە بۆ بێ تاوانترین زیندانی

ڕەنـگە زانیبێتـت، دیرۆکنووسـەکە کەوتە ڕێ. بە دوای نەوارە کۆنەکانـدا ڕۆیـی. منـیش نەوارە تازەکـانم پاراسـتوون و لە بەرم گرتـوونەتەوە و خەمی بزربوونیانت نەبێ. خەمی ماڵەکەشت نەبێ. ناوە ناوە دەچم و گوڵ و درەختەکان ئاودەدەم.

لە بارەی باخچەکەتەوە شتێک دەڵێم، بە خەونی خەیاڵی مەخوێنەوە. چۆنی دەڵێم ئەوهایە. گوڵەکان شـێوەی ئەسـتێرەیان گرتـووە. لە تاریکـایی دەدرەوشـێنەوە. هەر مـن نـا، هەر کـێ سـەر بەو حەوشەدا دابگرێ، دەڵێ:

ئەوە چیە، ئەو ماڵە ئەستێرەی لێ رژاوە؟

ژنەکانی دراوسێ دەڵێن:

ئەو ماڵە هەمیشە مانگەشەوە.

هەندێکیان لەو درەوشانەوەیە ترسان و باریانکرد. لەو بارەیەوە چیدی ناڵێم کە بەربووی بە چاوی خۆت ئەستێرەکانی ماڵێت دەبینی.

وا دەبینم لەو ماوەیە گۆڕانی گەورە بەڕێوەیە. پایتەختی خوێن شلۆقە. هەر دیتت، وەرگەڕا. لەگینە هەینێ لە بارەی هەندێ لە ئەستێرەکان بە زانیاری زێتر بکەوین. برادەرەکەش رۆژانە دەچێتە ئاقارێ و بست بست بە دوای گۆڕی ئەستێرەدا دەگەڕێ و دەڵێ:

دیتنەوە یان مردن لە رێی دیتنەوە.

ژنی ئەستێرەداریش کەوتۆتە گەڕان. زیندان زیندانی رووخاوی عێراق دەگەڕێ. ئێ ئەوە خوایە جێماوێکی ئەستێرەداری دەستکەوێ. چاوەڕێم بێتەوە. تا نەوارەکانی بدەمێ و ئەو درێژە بە چیرۆکەکە بدات. ماڵەکەشت بەو دەسپێرم.

هەستدەکەم ئەگەر لێرە بمێنمەوە، بە دەردی تۆ دەچم.



لە میرغەزەبی دوێنێوە بۆ تۆ

سڵاو

چیدی ناتوانم سەردانت بکەم و لەو دیوی شیشەکانەوە بتبینم. لە دوا سەردان پاسەوانێک کە سەردەمی منیش لەوێ پاسەوان بوو، لە هاتنە دەرێ هەستمکرد ناسیمیەوە. بە پڕتاو خۆم بزرکرد و نەیگرتم. جاروبار سەر لە ئێواران رێم دەکەوێتە کۆڵانی جاران. لە نێوان ماڵی ئێوە و ماڵی پیری پەنهانزان، کۆنە ماڵی ئێمە بزرە و نایبینمەوە. هەر دوو ماڵ هەمیشە مانگەشەوە، دەبینم ئەستێرەکەی تۆ و پیری پەنهانزان دەبینم.

رەنگە بیستبێتت دوێنێ ئەو دەمە، بەغدا کە لە پەیکەرێک خۆی گرمۆڵە کردبوو، بە شێوەیەک لووتبەرزیی شکا، ئیدی نابێتەوە بەغدا. من جگە لە گەڕان لە دوای ئەستێرە، دیتنەوەی ئەبوو عەلاشم

کەوتە سەر. ئەگەر بیبینمەوە و بیهێنمە قسە، تیشکی ئەستێرەکان جوانتر دەردەکەون.

سبەی بەرە و ئەوێ دەڕۆم، تا دێمەوە تۆ لە ماڵێ بە!

****

لە کۆنە مەلاوە بۆ زیندانیی دوای ئازادی

سڵاوی ئەستێرەکان

ئەو مەلایەی فەتوای کوشتنی پیاوی ناو ئایەتان، ئەستێرەکەی ئێمەی دا، وەک جاری جاران و پتریش دەستی دەڕوات. فەقێیەکانی خۆی کە ئێستا دوازدە جەهلن، بە شاری وەرکردوون. ئەو فەقێیانە فەتوای وا دەدەن، شافیعی شەرمەزاردەکەن، ئەها:

تیزاب بۆ لاقڕووتان، شیر بۆ ملی ئارەقخۆران، گوللە بۆ ناو دەمی کۆمۆنیستان، زیندان بۆ ڕۆژوونەگران، مل پەڕاندن بۆ نوێژنەکەران...

مەلای فەتواچی پاسەپۆرتی دنیای لە گیرفانە. بە ئاسماندا ئەو سەر و سەری زەوی دەکات. بە ریشی فەتواوە دێ و دەچێ. لەو ڕۆژانە لە بارەی پیاوی ناو ئایەتانەوە گوتبووی:

هەر کەسێ کتێبەکەی بخوێنێتەوە، ئۆباڵ بەو ملە خوێنی حەڵاڵە.

سێزدەی زیندانی، چ بە دنیا بڵێم، تۆی خستۆتە زیندانێ و مەلای گۆڕین و فەقێکانیشی لەو خەڵکە بەرداوە! لەبیرت بێت، ماڵتان ئێستا مانگەشەوە، مانگەشەوێک چ مانگێک بە ئاسمان و زەویی نەبەخشیوە.

هیوام ئازادیتە.

## ٢٣

ئەورۆ دەبێتە یازدە ساڵی خشت، بە تاوانێک زیندانیم ئەستێرەکان چەند دەستیان تێدابووە، منیش هەر هێندە. زیندان نەیهێشت بە دوای چیرۆکی ئەستێرەکاندا بچم و بگەمە ئەو جێیەی دەبوو بگەمێ. بەڵام لێرەش، لە سەر دیوارەکانی زیندانیش چەند تیشکێکی پیری پەنهانزانم دیتەوە و رەنگە شتێک بخەنە سەر چیرۆکەکە.

لەو هۆدەیەی تەنیشتم پیاوێک هەیە لە سەردەمی هەڵهاتنی ئەستێرە زەردەکەوە تا ئێستا پێیەکی لە دەرێیە، پێیەک لە زیندان. سەربردەی ئەستێرە زەردەکە، یان بڵێم کچە فەلەی لە پیری پەنهانزانەوە بیستووە و بۆی گێڕامەوە. منیش وا بۆتانی دەنێرم، با بە دەنگی ژنی ئەستێرەدار بکەوێتە سەر نەواری دیرۆکی ئەستێران:

گۆتمە شوفێر:

بە دوای ئەو پەلە هەورە سپییەدا برۆ.

گۆتی:

کابرا تۆ شێتی؟!

گۆتم:

شێت نیم، هەورەکە ناچێتەوە ڕێیەک، ترۆمبێلی پێدا نەڕوات.

شوفێر بە نابەدڵی کەوتە دوای هەوری سپی.

من دڵنیابووم هەورەکە هەوری ناو خەونێیە و دەمباتەوە لای کچە فەلە. ئەو ڕۆژە ئاسمان هەوراوی بوو، بەڵام من پەلە هەوری خۆم دەناسیەوە. سپی سپی دەتگوت پۆلە کۆتری سپیە بە ئاسمانەوە. نەوی نەوی، لە هەندێ جێ زگی لە عەرد دەخشاند. بڕۆ بڕۆ، بە ڕێی قیر و قوڕ و بەردا بڕۆ، گۆتمە شوفێر:

چاوێکت لە سەر پەلە هەور بێ، لە هەوراز و نشێوان، لە پێچ و دەوران، بە تیسکێ ئاماژە دەدا.

هەور وای دەکرد، ڕێک وەک ناو خەونەکە تیسکێکی لە شێوەی قۆچی کێوی لێدەبۆوە و بۆ شوفێر دەبووە هێمای ڕێوبان. لە سەر ئاواییەک

هەور راوەستا. تێگەیشتم کێشە چیە. ڕێی ترۆمبێل نەما.

ماڵاوا شوفێر.

دابەزیم، بە ئاماژە گۆتمە هەور:

کام ڕێ؟

هەور نەرم نەرم کەوتە ڕێ، بە سێبەری هەوردا هەڵگەڕام و داگەڕام و دەمەو ئێوارە، ئێوارەیەکی تەڕوتووش، لە ئاواییەک ناوێکی وەک قومری پێوە بوو، هەور نەما. تەواو، نیشانەی دیدارە، دیداری کچە فەلە.

لە دوورەوە ناسیمەوە. پێشتر جاری دوو دیتبووم، بەڵام پتر بە دیتنی ناو خەونەکە ناسیمەوە. هەوبوو ئەستێرە زەردەکە بوو، لە فیشەکان زەرد زەرد دەچۆوە. دەبوو قسەی لەگەڵ بکەم. هەرچۆنێک بوو خۆم لێی نزیککردەوە و ڕێک قسەی ناو خەونەکەم پێگوتەوە:

ئەوشۆ نەچیە چ ڕێ، شۆڕش بۆسەی بۆت داناوەتەوە.

ئەسـتێرەی زەرد بە شـێتم تێگەیشـت و بە پێکەنینێکی پڕ درەوشانەوە گوتی:

سـوپاس مـامە، زار هەڵێـنە هەر شـتێکت دەوێ سەر چاوم.

زۆر هەوڵـم دا، شـتێک لە خەونەکەشـم بـۆی گێڕایەوە. ئەو بە پێکەنینەوە رۆیی. شەو گوێم لەو تەقانە بوو کە بە ئەستێرەی زەردیانەوە نا. بە پڕە پـڕە ئەوێـم بەجێهێشـت، ترسـام کەسـێ گـوێی لە قسەکانی نێوان من و کچە فەلە بووبێت.

لەبیـرمەکەن، سـەربردەی ئەسـتێرەی زەردیـش لەبیرمەکەن.

دیتـنەوە و خوێنـدنەوەی هێـل و وێـنەی سـەر دیوارەکان چاوی گورگی دەوێ. تێکەڵ و پێکەڵن و لە سەر ئێکن. نووسین لە سەر نووسین، وێنە لە سەر وێنە، لە سـەردەمی مەلیکەوە بە کۆمـاری و کوودەتـاوە وەرە تـا دەگەیـتە ئێسـتا. ئێسـتای کەس نازانی چی، ئێستای من کە نـازانم بڵێم بڕووخـێ و کێ و بژی کێ! نـازانم لە سـەر دیواری زیندانێ چ بنووسـم. ئەگەر بیسـتویەک سـاڵ لەمەوبەر بـا، سـەردەمی ئەسـتێرەدار و پیـری پەنهـانزان و کـوڕە

زیندانی و ئەوانە با، دەمزانی. بەڵام ئێستا لە خۆم سەر لێشێواوی.

یازدە ساڵە لە سەر دیواری زیندانێ جێ دەستی زیندانییان دەخوێنمەوە. بۆتە کتێبێکی وەک خۆم زیندانی. کتێبێک بە مەستی نەبێت نانووسرێتەوە. یازدە ساڵە بەزۆر بەڕۆژووم. بەڵام هێندەی لە چیرۆکی ئەستێران دەکاتەوە، ئەگەر بە زمانی دیواریش بێت دەبێت بگاتە دەرێی زیندان و لە دوورەوە لەگەڵ چیرۆکەکەی گرێدەدەمەوە:

لەو ژوورەی ئەبوو نەجم قامچیی راوەشاند و لە سەر پشتی پیری پەنهانزانەوە چەند ئەستێرەیەک خۆیان دا بەرێ. ئەوەتا ئەستێرەی ورد ورد، لە مێروولە وردتر بە سەر دیواردا روو لە دەرگا رێچکەیان بەستووە. تا هێندەی چاویلکە لە چاوتی نزیکنەکەیتەوە لە رێچکەی مێروولە دەچێ. بەڵام لە نزیکبوونەوەدا مێروولەی چی! ئەوە رێچکەی پیتە، پیت پیت دەیخوێنمەوە:

من ئەو پیاوەم ساڵی جارێک دڵم دەتریوێنێ، چیرۆکی من لێرە دوایی نایێ، دەگاتەوە...

ڕێچکەی وشە لە بن دەرگا دوایی دێ. سەرێ و خوارێ دەگەڕێم، بای نەداوەتەوە. هەر دەبێ سووڕابێتەوە دیوەکەی ئەودیو. ڕێگەم نادەن سەر بەودیودا بگرم. نەمزانی دەگاتەوە کوێ.

ئەو ژوورەش پێدەچێ جێی ئەستێرەدار بووبێت. ئەوەتا نەخشی خۆی لە سەر دیوارەکە کێشاوە. دەیناسمەوە، لە نامەی ژنەکەیەوە دەیناسمەوە.

ئەوەتا دەستەکانی پڕن لە ئەستێرە وەک چوکلێت بە سەر بووکدا بکات، وا دەکات و دەکەوینە بن ئەستێرەوە. دەیانناسمەوە و قسانیش دەکەن. هەموو لە درەوشانەوە ئەستێرەن. بەڵام لە شێوە، شێوەی جیاجیا دەگرن و لە دەنگیش هەر یەکەو دەنگێک. ئەوە کوڕەکەی غەزاڵی چاو ئەستێرەیە. هەر هێندەی گۆمکە خەنجەرە. هەڵبەز و دابەز دەکات. بەر لەوەی لە پەنجەرەکەوە ئاودیو بێ:

شا لە کوژانەوەی منەوە درەوشایەوە.

ئەوە کوڕەکەی عەبابەیلێ، لە شێوەی قازیبازاڕ خۆ دەردەخات، لە ئاودیوبووندا، گوتی:

ئاوابوونی من، لە سیروان بپرسن.

ئەوە لاوکبێژەکەیە، شێوەی قەوانی بەر تیشکی ڕۆژی وەرگرتووە و دەبریسکێتەوە، چاوم دادەخەم، هاتە بن گوێم:

بەندێ ڕۆمیا بەندەکێ گرانە.

چاوم هەڵێنا، نەمابوو.

دەیانناسمەوە یەک یەک ئەستێرەکان دەناسمەوە، دوا داود هات، لە شێوەی پەڕەسێلکەیەکی گڕدار بە بێدەنگی لە پەنجەرەکەوە ئاودیو بوو.

کوڕە ئالایش وەک ئەوەی لە فڕۆکەوە خۆ هەڵداتە خوارێ، لە بەر دەمم کەوتەوە، تیشکێکی بەو لاو بەم لادا گێڕا و لە شێوەی ئالایەکی لوولدراو خۆی لوودا و هێشتا نیوەی لەو دیوەی پەنجەرەکە بوو پرسی:

سەر لە ئێواران منیش لە ئاسمانی قەلاتێ دەبینی؟

ئەها سەرگەردانی خەندەی بایی، لە شێوەی دوو لێوی ئامادە بۆ ماچ یان گوڵێکی تازە پشکوتوو، لە سەر دەستی ئەستێرەدارەوە بۆ سەر دیوارەکە، لەوێوە پەڕ پەڕ تیشکان داوێ. تیشکەکان لە سەر شیشەی پەنجەرەکە ئاوازی ئەی ڕەقیب

دەنووسنەوە. دەبینم و دەبیستم، ئاوازەکەیان گوتەوە و ئاودیوبوون و نەمان.

کچە فەلە، ئێوە بڵێن ئەستێرەی زەرد، بە دوای خەندەی باییدا کەوتە سەما و درەوشایەوە، سیوەیلانە پێکەنی و گوتی:

شۆڕش بە دەستی خۆی منی رژاند.

ئەستێرەی زەرد لە ئاودیوبووندا، شتێکی گوت، تێینەگەیشتم.

لە درەوشانەوەی یەکەم پیاوی ناو ئایەتانم ناسیەوە. لە هەر تیشکێکی بە خەتی شکستە ناوی سوورەتێک خۆ نیشاندەدات. پیاوی ناو ئایەتان تەواوێک لە ژوورەکە تیشکی دایەوە و تا بزر نەبوو هیچی نەگۆ:

لە سەر دیوارەکە بە خوێنی خۆم ناوی بکوژەکەمم نووسیوە .

پیری پەنهانزان دوای هەمووان لە ناو لەپی ئەستێرەدارەوە خۆی هەڵدا و لە بن دەست و پێم نیشتەوە. سەرەتا رێک لە قەڵات دەچوو. قەڵاتی بە قەد ژمارەی ئەستێرەکانی گچکەکراوە، هەر هێندەی

هێلکەی حاجیلەقلەقی لێمابۆوە. لەپڕ وێنەی ئاگری گەمە پڕووشکی دا. ترسام بسووتێم، چاوم داخست و خۆم دا بن دیواریێ. کەوتمە نزا، کاتێ چاوم کردەوە، دیتم خۆی کۆدەکاتەوە، شێوەی قەڵاتەکەی گرتەوە و گوتی:

لەو رۆژانە دێمەوە.

لەو ژوورە من و ئەستێرەدارێ بێ ئەستێرە بە تەنێ ماینەوە. ئەوجا ئەمن لەبیرمچوو بڵێم لە یەکەمەوە تا دوا ئەستێرە، حەپەسابووم، زمانم بەسترا، ئەوا ئێستا زمانم گەڕا:

تۆ بۆ ئەو ئەستێرانەت بەرەڵلا کرد؟

دیتم بە بێدەنگی گچکە بۆوە، هێندەی گوڵەستێرەیەکی لێمایەوە. لە ناو پەنجەرە ئاوڕیدایەوە:

لەو تەنیشتە چاوەڕێتدەکەن. ئاگات لە ژنەکەم بێت.

دەستم گەیاندە شیشەی پەنجەرە، بانگی میرغەزەبێکم کرد. بە راوەشاندنی قامچی وەڵامی

دامەوە. سەری سێ پەنجەم خوێنیان تێزا. کشامەوە و میرغەزەب گوتی:

چەند رۆژێکت ماوە، شێت مەبە.

هەوکە لەو جێیە راوەستاوم کە پێش بیست و یەک ساڵ پیری پەنهانزانی لێ راکشابوو. لێرەوە بە لاوک و ئەی رەقیبەوە، لە بن چاودێریی ئەبوو عەلا و ئەبوو نەجم و ئەو ئەبووانە سەربردەی ئەستێرانی دەگێڕایەوە. ئێستا تینووی لاوکم، زۆر تینوو. بۆ لاوکێ هەر تاوانێ با نەشمکردبێ، پێیلێدەنێم و دەڵێم من بووم. هاتە سەرم بانگی میرغەزەب بکەم، زاریشم هەڵێنا، بەڵام دەنگی پیری پەنهانزان زارمی بەست. دەنگی ئەو پیاوە نەگۆڕاوە وەکو رۆژی پێش گرتنەکەی ماوە:

بگە قەڵاتێ ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە.

ماندووم، لە ترازم، لە سەر لادیوارێکی خشت لە سەر تیی بڵند راکشاوم. نازانم بە کام دیودا دەکەوم، کام دیویش لە مەرگ نزیکترە.

من ماڵاوا، تەواوکردنی چیرۆکەکە لە سەر ئێوە و ژنی ئەستێرەدارە.

## ٢٤

دوای دوا نـامە دەبـوو دوای دوو رۆژ ئازادبێـت، کەچی هەڕەشەی بکوژی برادەری ئەستێرەدار دوو ساڵی بۆ درێژکردەوە. بە دادوەری گوتبوو:

تا منی لەبیرمابێت، دەبێت لە زیندان بێت.

دوای سێزدە سـاڵ زیندانی لە نـاوی جێ و شـت، هەر قەڵات قەڵاتیتـی. وەک بڵێـی تەنـێ ئەو نـاوەی لەبیرمـابێ. دەمەو ئێـوارەی سـێزدەی سـێی دوو هەزار و هەشـتە. لە سـەر قەڵاتـێ روو لە زینـدان دانیشتووین. من بە دەنگگرێک و پاشۆلی هەواڵەوە، ئەویش چاوی لە ئاسمان بڕیوە و چ ناڵێ. من دەڵێم:

ئەبـوو نەجـم ئەوەی ژنەکەتـی دزی، بە گـۆڕەکە کەوتـۆتەوە. بە قـووچەکە بەرد نیشـانی کـردووە. تـا جێیەکە سیمبەند نەکراوە با بگەینێ.

ئەو چاو لە ئاسمان ناکاتەوە و چ ناڵێ.

من دەڵێم:

خۆی لێرە نەماوە، بە دوای ئەبوو عەلادا چۆتە شام و لە بارەی پیاوی ناو ئایەتانەوە هەواڵی نوێ دەهێنێتەوە.

ئەو چاوی بە ئاسمانەوە و قڕوقەپ.

من دەڵێم:

جوگرافیاناس لە رێیە، دوو نەواری پیری پەنهانزانی دۆزیوەتەوە. لە گینە ببێتە دەستپێکی بەشی دووەمی چیرۆکەکەم.

ئەو چاوی لە ئاسمانە و دەڵێی بیستن و گۆکردنی لە دەستداوە.

من دەڵێم:

دەنگۆیەک هەیە، گوایە پیری پەنهانزان پەیدابۆتەوە.

ئەو چاو لە ئاسمان ناکاتەوە و مێش مێوانی نیە.

من دەڵێم:

سـیزده سـاڵە چـاوەڕێتم، هێنـدە چـاوەڕێی ئەستێرەدارم نەکرد.

ئەو چـاوی بە ئاسـمانەوە و چـۆتە ئاسـمانێ نایەتەوە.

تاریک داهات، من دەڵێم:

نەوارەکە بە بێـدەنگی پڕبـۆوە، بە رسـتەیەک کۆتایی بەو چیرۆکە بهێنە.

ئەو جـوولەیەکی تێـدەکەوێ، بە شـوێن چاویـدا پەنجە بۆ ئاسمان درێژدەکات و دەڵێ:

+ ئەستێرەکان، ئەستێرەکان، دەرکەوتن.

- کوا؟ من نایانبینم.

+ بڕوانە جێی پەنجەم.

چەندی دەڕوانم هیچ نابینم، دەست دەخاتە سەر شانم، رادەچڵەکێم، نەرم شانم دەگوشێ، دەڵێ:

چاوت لە چاوم نزیکبکەوە و تەماشاکە.

وای لەو هەموو ئەستێرەیە، لە کاکێشان روونتر و درەوشاوەتر، من پێشتری ئەستێرەی وام نەدیتبوون، ئەها ناویان دەڵێ:

ئەوەی پێشی پێشەوە، پیاوی ناو ئایەتانە، جوان لێی بڕوانە دەیناسیەوە؟

ئای، دەڵێی شێوەی ئەوی گرت! چەند لەو وێنەیە دەچێ کە ئەستێرەدار نیشانی دام، شانم دەگوشێ و دەڵێ:

ئەوەی تەنیشتی، لای راستی، کوڕی غەزالی چاو ئەستێرەیە، دوای وی دوا داودە.

ئەستێرەکان لە دوای پیاوی ناو ئایەتانەوە دەبوونە سێ ریز، ناوی هەر کامیان دەڵێ، رێک شێوەی ئەو دەگرن، منداڵانە پێدەکەنێ و دەڵێ:

دەستی چەپ، سەرگەردانی خەندەی بایی، دوای وی، کوڕی عەبابەیلێ، دوای وی لاوکبێژە. ئەها ئەوەی دوای دوا داودیش ئەها شێوەی پەڕەشووت دەدات، ئەوە کوڕە ئاڵایە. ئەوانەی دواوە باش دیار نین، با نزیکتر بکەونەوە، ئەها، ئەوەی لە سەر هەموویانەوە زەرد دەچێتەوە، ئەستێرە زەردەکەیە، کچە فەلەیە...

له سەر قەڵاتەوە چ دەبینم! ئەوانە چۆن گەیشتنە ئاسمان و بوونە ئەستێرە، توند شانم رادەتەکێنێ و هەستدەکەم ئێمەش دەبینە ئەستێرە.

بەر لەوەی پۆلیسەکە تێمانبخورێ و له ئەستێرانمان بکات و بەشی یەکەمی چیرۆکی ئەستێرەی قەڵاتێ بنی بێ، سێزدە، سێزدە ئەستێرەی پێناساندم:

ببینه، ببینه، ئەوەی بنەوە، وەک بڵێی هەمووانی له سەر شانی خۆی راگرتووە و دەیهەوێ لێرە له سەر قەڵاتێ رایانگرێ، نایناسیەوە کێیە؟

ناسیمەوە، پیری پەنهانزان بوو.

---

کەریم دەشتی:

لێتان ناشارمەوە کەم ڕۆمانی کوردیم خوێندۆتەوە، هێندە پەنهان ئامێزو پڕ لە گێڕانەوەی وردی هەزار شوێن و جێگا بێت، زنجیرەی گێڕانەوە لەم ڕۆمانەدا زۆر سەرنج ڕاکێشە، گێڕانەوە لە ناو گێڕانەوەیە، خەونە لەناو خەون کە دەکرێ بڵێین ئاوایە:

ڕۆماننووس لە زاری ئەبوو نەجمەوە بابەتەکان دەگێڕێتەوە، ئەبوو نەجم لە زاری پیری پەنهانزان بابەتەکان دەگێڕێتەوە، پیری پەنهانزان لە زاری پاڵەوانەکانی ناو یادستانی خۆی بابەتەکان دەگێڕێتەوە، هەموو کاراکتەرەکانی ناو ژووری ڕۆمانەکەش گێڕانەوەی گێرانەوەکان دەور دەکەنەوە. ئەمانە هەمووی لە یەک کات و لە یەک ساتدا ڕوودەدەن و سەدەیەک لە مێژوو دەخایەنێ، ئەوەشیان لە ڕێگای سەدان قەرتاڵە لە وشەی ناوازە و دەگمەنەوە، ڕۆمانەکە چنینبەند دەکەن، بە شێوەی بونیاتێکی ئەندازەیی و میعماری نوسراوەتەوە کە ئێستەتیکای دەقەکە دەنەخشێنێ، ئەوانەی کە باسیشی دەکەم بەسە بۆ ئەوەی بە ڕۆمانێک بڵێین زۆر جوانە، دەتوانم بڵێم بە قەد ڕۆمانی (الغرانيق المبكرە)ی ئیتماتۆف و (مياه الربيع)ی تورگنیف و (آهوى من)ی دەوڵەتئابادی لەززەتم لێ وەرگرتووە.

ئەم ڕۆمانە شایەنی خوێندنەوەیەکی قووڵە کە پارچەیەک لە مێژووی بەسەرهاتەکان دەکات بە نموونەی ژیانی یەک سەدەی میللەتێک.






ناوەندی ڕۆشنبیری مەم و زین

Mem u zin cultural center

memuzin20@gmail

Mem u zin